

# پوختەی ژیانی
# پێشەوا ئازیزمان ﷺ


نوسینی:

سالار عومەر




# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : پوختەی ژیانی پێشەواو ئازیزمان محمد(ﷺ)

نوسینی : سالارعومەر

وشەسازی : دایکی ڕێزدار

نەخشەسازی ناوەوە: ستافی پڕۆژەی ئاگا

دیزاینی بەرگ : ڕێدارعومەر

نۆرە و ساڵی چاپ : ١٤٤٣ کۆچی،٢٠٢٢ زاینی،٢٧٢١ کوردی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە



بۆهەر ڕەخنە و پێشنارێك پەیوەندی بکەن بە نووسەر

 @salar_omer

 Salar Omer



**تێبینی:**

**بەڕێز قۆناغی یەکەمی ژیانی پێغەمبەری خودا کراوەتە ئەم چوار بەشەی خوارەوە :**

**بەشی یەکەم:** میژووی جیهان پێش هاتنی ئیسلام :

**بەشی دووەم :** بنچینە و شارستانییەتی عەرەب پێش هاتنی ئیسلام :

**بەشی سێ یەم :** بارودۆخی ئاینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشت لەنیمچە دوورگەی عەرەبی پێش هاتنی ئیسلام :

**بەشی چوارەم :** چەند وێنەیەک لەژیانی پێغەمبەری خوا،لەکاتی لەدایک بوونی تا هاتنی وەحی :



## بەشی یەکەم:
## مێژووی جیهان پێش هاتنی ئیسلام :

### یەکەم : ئیمراتۆرییەتەکانی جیهان :

پێش هاتنی ئیسلام چەند ئیمپراتۆرییەتەک لەدەسەڵات بوون و خەڵکیان دەکردکۆیلە و باج و سەرانەی زۆریان لێوەردەگرتن و نانێکی کەمیان لەبەرامبەردا پێدەدان و چەوسانەوە و ترساندن و هەڕەشە کاری سەرەکی ئەو ئیمپراتۆریەتانەبوو.

### چەند ئیمپراتۆرییەتێکی مەزنی پێش ئیسلام :
### یەکەم : ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی :

ڕۆژهەڵات بەئیمپراتۆریەتی بێزەنتی دەناسرا،بێزەنتیەکان دەسەڵاتیان هەبوو بەسەر دەوڵەتەکانی : ( یۆنان و بەلقان ئاسیا و سوریا و فەڵەستین و حەوزی دەریای ناوەڕاست هەمووی،میصر و هەموو ئەفریقای باکوور).[1]

پایتەختی ئەو ئیپراتۆریەتە قوستەنتینیەبوو،دەوڵەتێکی زۆر ستەمکاربوو ،ئەو دەوڵەتانەی لەژێر دەسەڵاتی بوون زوڵم و ستەمی زۆری لێدەکردن و باجی زۆری لێ دەسەندن و کەمترین خواردن و مافی پێدەدان ژیانێکی کولە مەرگی و خراپتریش دەژیان.

---

[1] صەلابی



زۆرجار بەهۆی باجی زۆر و قەرزەوە ژێردەست خراوەکان منداڵەکانیان دەفرۆشت تا قەرزەکانیان پێ بدەنەوە[1]،گەر خەڵکیش ناڕازی بوان لەلایەن دەسەڵاتەوە لەڕێگەی هێز و دەسەڵات و ترساندن ئەو بوارەیان نەدەهێشت بۆ شۆڕش و دەنگی ناڕازییان دادەمرکاندەوە.

بەگشتی ئەو ئیمپراتۆرییەتە مامەڵەی مەڕێکی شیردەرییان لەگەڵ ژێر دەستەکانیان دەکرد،بەباشی خەڵکییان دەدۆشی و بەخراپی خۆراکیان دەدا.

فەرمانڕەواکانیش لەباشترین حاڵی ژیان و گوزەران و ڕابواردندابوون و لەڕووی خواردن و پێویستی و پێداویستی و ماددی و ئافرەت و خۆشییەکانی سەردەم لەقیممە بوون،نەک لەهیچیان کەم نەبوو بەڵکو هێندەی سەدان ساڵیش لێیان زیاد بوو.

## دووەم : ئیمپراتۆریەتی فارسی :

بەئیمپراتۆرییەتی کیسرا دەناسرا،زۆر لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی گەورەتر و بەهێزتربوو.

ئەم ئیمپراتۆرییەتە لە سەدەی ٣ ی زاینی لەسەر دەستی مانی دامەزرا،دواتر لەسەدەی ٥ ی زاینی موزدەگی سەریهەڵدا،لەو سەردەمە بانگەشەی بەڕەڵایی و هەموو شتێک دەکرا.

---

[1] (السیرة النبویة) نەدەوی



پادشاکانیان لەڕێگەی میراتەوە دەسەڵاتیان وەردەگرت و خۆیان لەسەرووی ئادەمیزاد ئەژماردەکرد،وە خۆیان بە نەوەی خوداکان دەزانی،وە داهات و موڵکەکانی وڵات هەمووی لەدەستی خۆیان بوو و خۆیان کردبوویە خاوەنی.

جوتیارەکان دەستیان لەکار هەڵگرت و بەرەو کڵێساکان هەنگاویان نا لەترسی باج و سەربازیکردن،چونکە ئەوان سوتەمەنی بێبەهابوون بۆ ئەو جەنگە بێبەهایانەی لەو سەردەمانەدا هەڵدەگیرسان و ساڵانێکی زۆر بەردەوام دەبوو،لەکاتێکدا ئەو جەنگانەش هیچ پەیوەندییەکی بە ئەوانەوە نەبوو،تەنها ئەوەنەبێت کە جێبەجێ کردنی ئارەزووەکانی پادشاکانی تێدابوو.

## سێ یەم : ئیمپراتۆریەتی هیند :

نالەبارترین کاتەکانی هیندستان لەڕووی ئایین و سیاسەت و ئابووری لەسەدەی شەشی زاینی بوو.

بێ ئابڕوویی لەهەموو شوێنێک بڵاوببویەوە،پەرستگاکانیان بتپەرستی بوو،هیچ نرخێک بۆ ئافرەت نەبوو کاتێك پیاو بمردایە ژنەکەشیان دەسوتاند و لەگەڵی لەگۆڕیان دەنا.

ئەو وڵاتە لەحاڵەتی پشێوی و شڕدابوو ،میرنشینەکان لەنێوان خۆیان لەجەنگدابوون،و هیندستان دوورە پەرێزببوو لەجیهان و دابڕابوو.

هەروەها شێوازی بەتوندگرتن و زیادەڕەوی لەداب و نەریت و چینایەتی و دەمارگیری بۆ ڕەگەز و نەژاد بەئاشکرا زاڵ ببوو بەسەریاندا.

دانیشتوانی هیندستان دابەش دەکرانە سەر چوار بەش و چین :





**یەکەم : چینی قەشە (بەراهمە)** : ئەمانە پلە و پایەیەکی زۆریان هەبوو و کەس لەگەڵیان بەژدار نەبوو،بەراهیمە پیاوێکی لێخۆش بوو بوو،ئەگەر سێ جیهانەکەشی بە گوناهەکانی لەناو ببردایە،هیچ باجێکی لەسەر نەدەچەسپا،لەهیچ حاڵەتێکیش سزای کوشتنیان بەسەر نەدەسەپێنرا.

**دووەم : چینی جەنگ و سەربازەکان.**

**سێیەم : چینی جوتیارو بازرگانان.**

**چوارەم : چینی خزمەتکاران کە ( شودەریان ) پێ دەگوترا** : ئەمانە خراپترین چین و چەوساوەترین چینی کۆمەڵگابوون،چونکە هیندییەکان باوەڕیان وابوو دروستکەری گەردوون ئەو چینەی لەقاچی خۆی دروست کردووە.

ئەم چینە هیچ مافێکیان نەبوو کاریان تەنها خزمەتکردنی سێ چینەکەی تربوو،وە بۆیان نەبوو ببنە خاوەنی ماڵ،یان پاشەکەوت بکەن یان لەگەڵ بەراهیمەک دابنیشن، یان دەستی لێ بدەن یان فێری کتێبەکەیان بن.[1]

## دووەم: بارودۆخی جیهان لەڕووی ئاین پێش ناردنی ئیسلام :

مرۆڤایەتی لەهەموو بوارەکانی ژیان لەخراپترین دۆخ دابوو،لەڕووی ئاینیش بەخراپترین قۆناغەکان تێدەپەڕی،هەرچی ئاینە ئاسمانییەکانیش بوون هیچ کاریگەریان نەمابوو چونکە دەستکاریان کردبوون و دەقەکانیان گۆڕیبوو.

[1] ( السيرة النبوية)ی نەدەوی لاپەڕە ٢٨ بڕوانە ( القانون المدنى الاجتماعى) کە پێی دەگوترێ منوشاسنز بەشەکانی ١-٨-٩-١٠





ئەوانەشی تاک تاکە حەقیقەتیان دەزانی ڕۆیشتبوون و ئومێدێکیان نەمابوو بەچاکسازی،وە لەبەر شەڕیش تا پارێزراوبن و نەکوژرێن لەبەر ئەوەی بەردەوام جەنگ و شەڕ ڕووی دەدا.

ئەم خراپە کاریانە لەلایەن قەشە وسەرکردەی گەل و بازرگان و کاربەدەستانەوە ڕابەرایەتی دەکرا،جیهان کەوتبووە تاریکایەتییەکی بێ وێنە کە ڕووناکی تێدا بەدی نەدەکرا.

**یەهوودیەت:** ببوە کۆمەڵێک ڕێوڕەسم و داب و نەریتی بێگیان،وە کاریگەری نەتەوەکانی تریشی لەسەربوو وە بتپەرستیش زاڵ بوو بەسەریان.[1]

**مەسیحیەت** : مەسیحیەت توشی تاقیکردنەوەبوو لەڕێگەی توندڕەوەکان و گۆڕانی نەفامەکانەوە، هەورەڕەشەکانی نەفامی ڕۆشنایی یەک خوا پەرستی و دڵسۆزی بۆ خوای گەورەی شاردبوویەوە.[2]

(هەروەها ئەوانەی وازیان لەبت پەرستی هێنابوو،لەژێر پەردەی مەسیحیەتەوە هەڵسان بەناونانی شەهیدێک لە شەهیدەکان و هەمان سیفاتی خودایان پێدا،ئینجا پەیکەریان بۆ دروست کرد،بەمشێوازە شرک و بتپەرستی گوازرایەوە بۆ ئەو شەهیدە ناو خۆییانە،ئەم سەدەیە تێنەپەڕی تاکو پەرستنی شەهید و پیاو چاکان بڵاوەی نەکرد.

ئینجا بیروباوەڕێک دروست بوو ئەوەبوو کە ئەولیاکان خەسڵەتی خوداکانیان هەیە،ئیتر بوونە هۆکار لەنێوان خوا و مرۆڤەکان،ئەمە بەپێی

---

[1] (السيرة النبوية)ی نەدەوی لا ٢٠

[2] (السيرة النبوية) نەدەوی





بیروباوەڕی ئەریسەکان،وە بوونە سیمبوولی پیرۆزی سەدەکانی ناوەڕاست،لەڕووی پاک و بێگەردییەوە.

ناوی جەژنە بتپەرستییەکانیش گۆڕان بۆ چەند ناوێکی نوێ ،تەنانەت لەساڵی ٤٠٠ی زاینی جەژنی خۆری کۆن کرا بە جەژنی لەدایک بوونی مەسیح)[١]

هەروەها پەلهاوێشتنی ئەو بیروباوەڕەی دەڵێت : خوای تاک و تەنها پێکهاتووە لە سێ کەس لەهیزری مەسیحییەتدا،لەکۆتایی سەدەی چوارەم مایەوە و بەردەوام بوو وەکو بیروباوەڕی باوەڕ پێکراو لەهەموو جیهانی مەسیحی.[٢]

مەجوسییەکان: هەر لەکۆنەوە بە پەرستنی ڕەگە سروشتییەکەیان دەناسران،کە لەهەموویان گەورەتر ئاگر بوو.

پەرستگاکانی وڵات لەهەموو لایەکەوە بڵاوەی کردبوو،خەڵکەکەش خەریکی پەرستنی ئاگربوون.

بەرهەمییەت :ئاینی ڕەسەنی هیندییەکان،تایبەتمەندی لەزۆری پەرستن و خوداکانیان هەبوو،ئاینی هیندۆکی و بوزیش هەردووکیان بتپەرستن.

سەر ڕووی زەوی لەمسەر بۆ ئەوسەر پڕی بوو لەبت پەرستی،هەر میللەتێکیش خوایەکانی خۆی گەورەتر ڕادەگرت لە ئەوانی تر و خۆیان بەباشتر دەزانی .

---

[١] کتێبی (تاريخ المسيحية فى ضوء العلم المعاصر )

[٢] کتێبی ( دائرة المعارف الكاثولوكية الجديدة )





## بەشی دووەم :

### بنچینە و شارستانییەتی عەرەب پێش هاتنی ئیسلام :

وشەی عەرەب واتای بیابان و چۆڵەوانییەکی وشک و بێ ئالیف دەدات،ئیتر ئەم ناوە بەسەر دوورگەی عەرەبیدا و هەر لەوێشەوە بەئارییەکانی ئەو ناوچەیەش وتراوە ( عەرەب ).

دوورگەی عەرەبی لە ڕۆژئاوایەوە دەریای سور سنووریەتی لەگەڵ نیمچە دوورگەی سینا،لەڕۆژهەڵاتیشەوە سنووری بە کەنداوی عەرەبی کۆتایی دێت، لەگەڵ بەشێک لەخاکی باشووری عێراق و باشووری دەریا عەرەبی کە درێژەی دەریای هیندە،لەئاراستەی باکووریشەوە بە سنوورەکانی شام و پارچەیەکی دیکە لە خاکی عێراق کۆتایی دێت،( سەرباری ڕاجیاییەک لەسەر ئەم سنوورە)،ئیدی ڕووبەرەکەی خەمڵێنراوە بەملیۆنێک تا ملیۆن و سێ سەد هەزار میل چوارگۆشە.

دوورگەی عەرەبی لەڕووی سروشتی و جوگرافییەوەگرنگییەکی زۆری هەیە،بەڵام لەناوخۆدا بە بیابان گەلی فراوانی لماوی دەورە دراوە و هەر لەبەر ئەوەشە داگیرکەران نەیانتوانیوە داگیری بکەن و بیکەنە ناوچەی خۆیان.

ئیدی هەر لەدێر زەمانەوە خەڵکی ئەو دەڤەرە ئازادانە ژیاون،سەرباری ئەوەی هاوسنوور بوون لەگەڵ دوو ئیمپراتۆریەتی مەزندا ،کە ئەگەر ئەو قەڵا لمینەی چوار دەوری نەبوایە زەمانێکی زۆر بوو داگیر کرابوو.

بەڵام لەڕووی قارەکانەوە: دەکەوێتە نێوان قارە ناسراوەکانی کۆنەوە،لەئاراستەی باکووری خۆرهەڵاتەوە دەکەوێتە نێو قارەی ئەفریقا.

لەباکووری خۆر هەڵاتەوە وەک دەستپێکی قارەی ئەوروپا وایە.



لەدیوی باکووریشەوە دەرگا بەڕووی عەجەمەکاندا دەکاتەوە، پاشان ئاسیای ناوەڕاست و باشووری،پاشان دەلکێت بە هیندستان و چینەوە.
هەروەها کۆی قارەکان لەڕێگەی ئاوییەوە دەلکێن بە دوورگەی عەرەبییەوە و لەڕێگەی کەشتییەکانەوە لە کەنارەکانییدا لەنگەر دەگرن.
هەر لەبەر ئەم جێکەوتە جوگرافیەیەتی کە باکووری دوورگەکە و باشووری بووبوونە نشینگەیەکی چاکی میللەتان بۆ ئاڵوگۆڕی بازرگانی و ڕۆشنبیری و ئاینی و هونەری.[1]

## یەکەم: بنچینە و شارستانیەتی عەرەب :

**بەپێی وەچەکان مێژوو نوسان بنچینەی عەرەبیان کردۆتە سێ بەش :**

**١-عەرەبی لەنێوچوو (البائدە)** : ئەمانە ئەو عەرەبانەن بەتەواوی توخمیان لەناوچووە و زانیاری پێویستیان لەسەرنییە،وەک هۆزەکانی ( عاد و ثەمود و تەسەم-جەدیس- عیملاق-ئومەیم-جرهوم-حەزوور-وەبار-عەبیل- جاسم – حەزرەمەوت-ەی تریش) ،وە ئەوانە هەندێك پادشایان هەبوو موڵکەکانیان تاکو شام و مصری دەگرتەوە[2].

**٢- عەرەبی عاریبە** : ئەوانەش بریتین لەو عەرەبانەی کەدەبنە نەوەی ( یەشجوبی کوڕی یەعروبی کوڕی قەتحان).

---

[1] الرحيق المختوم.
[2] الرحيق المختوم
سیرەی صەلابی .



بە عەرەبی قەحتانی و باشووریش دەناسرێن.[1]

**٣-عەرەبی عەدنانی (عەرەبی موستەعرەبە" بەعەرەبکراو" )** : ئەوانە ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ ئیسماعیلی کوڕی پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه‌السلام).

بۆیە پێیان دەڵێن بە (عەرەبکراو) چونکە ئەوانەی کە خوێنێکی نا عەرەبی هاتۆتە گیانیان و دواتر یەکگرتن ڕوویداوە لەنێوان عەرەب و ئەو خوێنە،زمانی عەرەبیش بوو بەزمانی نوێی ئەم ئاوێتەیە.

لەکتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری خودا باسی چەندین هۆز و تیرە کراون و باسی دابەشبوونیان کراوە بەسەر ناوچە جیاوازەکان،بەڵام ئەوەی یەکدەنگی لەسەرە ئەوەیە،کە عەرەب دابەش دەبێت بەسەر عەدنانی و قەحتانی،بەبۆچوونی زانایان و ڕەچەڵەک ناسانیش بەوشێوەیە،بەڵام هەندێکی تر لەزانایان پێیان وایە عەرەبی عەدنانی و قەحتانی دەگەڕێنەوە بۆ نەوەی ئیسماعیل (علیه‌السلام ).

## دووەم : میرنشینەکانی عەرەب :

لەسەردەمانی زووەوە چەند میرنشینی ڕەسەن و شارستانییەتێکی بەناوبانگ دروست بوونە لەوانە :

**یەکەم : میرنشینی "سەبەئ "لە یەمەن :** ئەم میرنشینە بەیەکێک لەکۆنترین گەل دادەنرێن کە لەیەمەن ناسرابن،مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ٢٥ سەدە پێش زایین،وە گەشەسەندنی شارستانێتییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ٢١ سەدە پ.ز.

---

[1] هەمان سەرچاوە.





لە ٦٢٠ ی پ.ز ١٣٠٠ ی.ز دەوڵەتەکەیان بە مەعینییەکان ناسرابوو ، لەوشکانییەکانی نێوان نەجران و حەزرەمەوتدا نیشتەجێبوون،دواتر ژمارەیان هێندە زۆربوو تەشەنەیان سەند تاگەیشتە –عولا-و-مەعان- لەرۆژهەلاتی حیجاز. لەرووی ئابوورییەوە پشتیان بەبازرگانی دەبەست،قورئانیش باسیان دەکات کە سوودیان لەئاوی باران و لافاوەکان بینیوە،بەنداوی و عەمبارییان دروست کردووە بەشێوازێکی ئەندازیاری پێشکەوتوو،لەو سەردەمیشدا –بەنداوی مەئرەبەیان دامەزراندووە،کە گرنگییەکی زۆری لەمێژووی یەمەندا هەیە،کەخێری زۆرییان لێ بینی لەرووی زەوی و زارەوە بۆ بەرهەمهێنان و کشتوکاڵ و باخچەی پڕ لەدار و درەختی ڕازاوە و بەروبوومی بەتام.

پەروەردگار دەفەرموێت: ((لَقَدۡ كَانَ لِسَبَإٖ فِي مَسۡكَنِهِمۡ ءَايَةٞۖ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٖ وَشِمَالٖۖ كُلُواْ مِن رِّزۡقِ رَبِّكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥۚ بَلۡدَةٞ طَيِّبَةٞ وَرَبٌّ غَفُورٞ(١٥)فَأَعۡرَضُواْ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ وَبَدَّلۡنَٰهُم بِجَنَّتَيۡهِمۡ جَنَّتَيۡنِ ذَوَاتَيۡ أُكُلٍ خَمۡطٖ وَأَثۡلٖ وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ(١٦) ).[1]

هەروەها لەگەڵ ئەم هەموو ناز و نیعمەتەی خوای گەورە بەسەریدابارandن بەشێوەیەک کاروان و بازرگانەکان کاتێك لەیەمەنەوە دەردەچوون لەژێر سێبەر و خواردنی زۆر و ئاویان لێنەبڕاوە،تا ئەوکاتەی یادی خوایان بیر چوو و ناشوکرییان کرد و بوونە قەومێکی بێخێر،وەک پەروەردگار دەفەرموێت : - ((وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ ٱلۡقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا قُرٗى ظَٰهِرَةٗ وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَۖ سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ(

[1] [سورة سبأ ١٥-١٦]



**١٨)فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدۡ بَيۡنَ أَسۡفَارِنَا وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَ وَمَزَّقۡنَٰهُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ(١٩))**[١].

هەروەها ئەم گەلە پادشاكانییان ناودەنا -مەكرەبی سەبئ - وە پایتەختەكەیان لە شاری – سیرواح-بوو،(٢٢ تا ٢٦) پادشا لەم ماوەیەدا فەرمانڕەوایەتییان كردووە.
لەساڵەكانی -٦٢٠ تا ١١٥-پ .ز ، وشەی مەكرەب یان لادا لەنازناوی پاشاكان و لەم ماوەیەدا بە دەوڵەتی – سەبەئ - ناسران،و پایتەختەكەیان گواستەوە بۆ مەئرەب كە ١٩٢ كیلۆمەتر لەڕۆژهەڵاتی سەنعاوە دوورە.
لە (١١٥ ی پ.ز تا ٣٠٠ ی زاینی ) دەوڵەتەكەیان بە "حەمیرییەی یەكەم" ناسرا.
لە ساڵی ( ٣٠٠ زاینی تا هاتنی ئیسلام ) دەوڵەتەكەیان بە "حەمیرییەی دووەم " ناودەنرا،پادشاكانیش ناودەبران بە (فەرمانڕەوای سەبەئ و ڕەیدان و حەزرەمەوت و یەمەن).
هەروەها شەڕ و ئاژەوەی زۆر ڕوویدا كودەتا دەكرا شەڕی نێو خۆیی دنیای تەنی بوو،بەم هۆیەوە ڕێگە بۆ ڕۆمەكان خۆش بوو خزانە ناو یەمەن و دەستیان بەسەرداگرت.
دواتر حەبەشییەكان توانییان لەساڵی ٣٤٠ ی زایینی یەمەن بخەنە ژێر ڕكێفی خۆیان تا ٣٧٨ ی زاینی،كە دیسان یەمەن سەربەخۆیی خۆی وەرگرتەوە.

---

[١] [سورة سبأ]





لەم ماوەیەدا بەنداوی مەئرەب درزی تێبوو،وەلافاوە مەزنەکە ڕوویدا لەساڵی (٤٥٠ -٤٥١) ی زانینی کە زیانێکی وای تووشکردن ماڵ و حاڵی بۆ نەهێشتنەوە.

لەساڵی ٥٢٥ زاینی "ئیریات" پادشای یەمەن بوو تا ئەوکاتەی " ئەبرەهەی کوڕی سەباحی ئەشرەم" کوشتی و خۆی چووە شوێنی،وە لەساڵی ٥٤٩ ی زاینی دوای ڕازیکردنی حەبەشە "ئەبرەهە"بووە سەرداری ووڵات،کەدواتر ئەبرەهە چوو بەرە و مەککە تا کەعبە بڕوخێنێ،دواتر لەزەلیلی و شکاوی و پەشۆکاوییەوە گەڕایەوە یەمەن و مرد،دوای ئەو کوڕەکانی (یەکسوم دوای ئەویش مەسروق )کە وەکو باوکیان خوێن ڕێژبوون دەستیان کرد بە کوشتن و زوڵم و ستەم.

بەڵام خەڵکی یەمەن دوای ڕووداوی "فیل" هانایان بۆ فارسەکان برد و بەیارمەتی ئەوان حەبەشییەکانیان لەوڵاتی یەمەن بەدەرنا،و لەساڵی ٥٧٥ زاینی سەربەخۆییان وەرگرتەوە بەسەرکردایەتی "مەعدیکریب سەیف کوڕی زی یەزنی حیمەیری" و دواتر کردیانە گەورەی خۆیان.

بەڵام مەعدیکریب کۆمەڵێک حەبەشی وەک خزمەتکار و بەردەست لامابوویەوە و خزمەتیان دەکرد،دواتر ئەو خزمەتکارانە کوشتیان،بۆیە دەسەڵات لەدەستی " زی یەزن " نەمایەوە بووە وڵاتێکی ژێردەستەی فارس،پاشاکانیان هورز و کوڕەکەی هورز و پاشان تینجان ی کوڕی ،کوڕی تینجان و پاشان " بازان" کە کۆتا فەرمانڕەوای فارس بوو لەساڵی ٦٢٨ ی زاینی ئیمانی هێنا بە پێغەمبەری خوا و دەسەڵاتی فارس بەسەر یەمەنەوە کۆتایی پێهات.



**سەرنجێك :**

میرنشینی سەبەئـ یەمەن ،سەرەتا خوای گەورە هەموو چاکەیەکی بۆ ناردن لەئاسمان و لەزەوی بەرەکەت و نازو نیعمەتی بۆ باراندن بەشێوەیەک بەچەندین کیلۆمەتر ڕێکردن سێبەری دار و ئاو و خواردنیان لێ نەدەبڕا.

بەڵام دوای ئەوەی لەخۆیان دەرچوون و سنووریان بەزاند و سوپاس گوزار نەبوون لەسەر نازونیعمەت.

دوای ئەوەی کەوتنە شەڕ و ئاژاوە و فەساد و خوێن ڕشتن.

خوای گەورە ناز و نیعمەتی لێ گرتنەوە،سەرەتایەکی سەربەخۆ و کۆتاییەکی ژێر دەستە و ڕەزیلی پێدان.

لەباشترین سەرکردەوە گەیاندنی بە بەخراپترینیان کە ئەبرەهە و کوڕەکانی بوون،و دوای ئەو خستنیە ژێر دەستی فارس،تا لەکۆتاییدا بە ئیسلام ئازادی کردنەوە.

هەر گەلێک سوپاس گوزار نەبێ و لەخۆی دەرچێت و پشت لەخوا بکات و دوای نانەوەی فەساد بێ ئیللا خوای گەورە ئەو گەلە ڕیسوا دەکات،نمونەش لەمێژوو و واقع دا زۆر زۆرن.

**میرنشینی عاد لە ئەحقاف :**

ئەوانە خوای گەورە پێغەمبەر هود (علیه السلام) ی بۆ ناردن،لەباکووری دوورگەدا دەژیان،خاوەنی خانو و ماڵی جوان و کارگە و کشتوکاڵی و کانی زۆر بوون.

پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێت : ((كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ۝ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ۝ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ۝





وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝ أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةٗ تَعۡبَثُونَ ۝ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمۡ تَخۡلُدُونَ ۝ وَإِذَا بَطَشۡتُم بَطَشۡتُمۡ جَبَّارِينَ ۝ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ۝ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعۡلَمُونَ ۝ أَمَدَّكُم بِأَنۡعَٰمٖ وَبَنِينَ ۝ وَجَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ)[1]

**ثەمود لە حیجاز:**

لە وڵاتی حیجاز شارستانییەتێکی بەهێز هەبووە،خەڵکەکەی خانوویان تاشیوە لەچیاکان،وە خاوەنی باخ و کێڵگە و کان بوون.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت :- ((كَذَّبَتۡ ثَمُودُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ۝ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ۝ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ۝ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝ أَتُتۡرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ۝ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ۝ وَزُرُوعٖ وَنَخۡلٖ طَلۡعُهَا هَضِيمٞ ۝ وَتَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا فَٰرِهِينَ ۝ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ )[2]

[1][سورة الشعراء ١٢٣ - ١٣٤]

[2][سورة الشعراء ١٤١ - ١٥٠]



## بەشی سێ یەم :
## barووdۆخی ئاینی و سیاسی وکۆمەڵایەتی ورەوشت لەنیمچە دوورگەی عەرەبی پێش هاتنی ئیسلام :

### یەکەم : مەککە و نیمچەدوورگەی عەرەبی لەڕووی سیاسییەوە :

دانیشتوانی دوورگەی عەرەب دەبوون بە دوو بەش:

١-**بیابان نشین** : ئەمانە لەبیابان دەژیان هەردەم بەدوای لەوەڕدا هاتووچۆیان دەکرد ،لەهەر کوێیەک ئاو هەبا دەیانکردە نشینگە و دەمانەوە.

ئەوانە لە چادر ( خێمە)دا دەژیان تایبەت لەباکووردا لە نەجد و حیجاز و توهامە.

٢-**شار نشین** :ئەمانە لەشار و گوندەکاندا دەژیان و خانوویان لەخشت دروست دەکرد،زۆربەی ئەوانە لە باشووردا لەناوچەی یەمەن و دەوروبەری و لەسەر سنوورەکانی وڵاتی ڕۆم و فارسدا دەژیان.

بەگشتی لەناو عەرەبدا سیستەمی باو لەناویاندا سیستەمی هۆزایەتی بوو،تەنانەت لەشانشینە پێشکەوتووەکانیش کە لەدوورگەکەدا دروست بوون ،وەك یەمەن لەباشوور و شانشینی حیرە لەباکووری ڕۆژهەڵات،شانشینی غەساسینە لەباکووری ڕۆژئاوا،هۆزەکان وەکو یەکەیەکی یەکگرتووبوون و هەرمانەوە.

هۆکاری مانەوەی هۆزەکانیش ئەوەبوو سیستەمی هۆزایەتی ئازادی تیا بەدی دەکرێت،عەرەبەکانیش لەکەش و هەوایەکی ئازاد دا پەروەردە دەبوو ،بۆیە ئازادی یەکێك بوو لەدیارترین سیفەتەکانی عەرەب.





هەرچەندە لەناو هۆزەکان جەنگی گەورەی خوێناویش ڕوویدەدا وەک جەنگی (الفجار).

ئەم شەڕانەش لەبەر چەند هۆکارێك بوو لەوانە :

-کەسێتی :واتە بەرگریکردن لە هەر کەسێک کەهانای بۆ بردبان،تایبەت لەهۆزی خۆیان بوایە و بەبرای خۆیان زانیبا لەوەیان نەدەپرسی لەسەر حەقە یان نا...زاڵمە یان مەزڵوم،بەڵکو ڕاستەوخۆ پشتیان دەگرت.

-لەپێناو بژێوی ، هەندێ هۆز هەبوون بژێوییان لەسەر شمشێرەکان بوو،بۆیە هیچ هۆزێك متمانەی نەبوو هۆزێکی تر هێرشی نەکاتە سەر لەهەر کاتێکدا ڕۆژ یان شەو،تا ماڵ و موڵکیان نەبەن و تاڵانی نەکەن[١]

بۆیە لە ڕووی سیاسیيەوە، نیمچەدوورگەی عەرەبی لێک هەڵوەشابوو، نە دەوڵەتێک یەکی دەخست و نە حکوومەتێک بەڕێوەی دەبرد، دەوڵەتە دێرینەکانی کە لە یەمەن و نەجد و دەورووبەری عێراق و شام بوون لێک هەڵوەشابوون، و ژیانی کۆچەری دەستی بەسەر شارەکانی حیجازدا گرتبوو، و هۆزەکان یەکەی سەرەکیی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوون.[٢]

وە کاروبارەکانی مەککە لە ڕێگای دارول نەدوە بەڕێوەدەبرا. لە شاری مەدینە بە شێوەیەکی گشتیی بەردەوام کێشە و ناکۆکی لە نێوان ئەوس و خەزرەج هەبوو.[٣]

---

[١] دراسة تحليل لشخصية الرسول محمد ،د.محمد قلعجي ل.١٢

" [٢] كيف كانت الأوضاع السياسية في شبه جزيرة العرب قبل الإسلام" .موضوع

" .موجز الحالة السياسية عند العرب قبل الإسلام | سجل التاريخ".

" [٣] الجزيرة العربية الحالة السياسية والاقتصادية عند ظهور الإسلام - موقع مقالات إسلام ويب" .



دەوڵەتی مەنازرە لە حیرە و دەوڵەتی غەساسینە لە شام لەلایەن فارس و ڕۆمەکان ڕێگە بەگەشەیان درابوو، بۆ ئەوەی ببنە ڕێگر لەبەردەم فراوانخوازی عەرەبەکان. فارسەکان دەوڵەتی مەنازیرەیان هەشتساڵ پێش پێغەمبەرایەتی ڕوخاند.[1]

## دووەم: مەککە و نیمچەدوورگەی عەرەبی لەڕووی ئابووری :

لە ڕووی ئابوورییەوە، دەشتەکییە عەرەبەکان پشتیان بە شوانکارەیی و کۆچکردن دەبەست بۆ ئەو ناوچانەی ئاویان لێیە، ئەمەش ببووە هۆی شەڕ بۆ دەستکەوتنی پێداویستییەکان، بەڵام لە شارەکاندا چالاکی بازرگانی و کشتوکاڵی و پیشەسازی هەبوو، مەککە چالاکی بازرگانی تێیدا باڵادەست بوو و ڕێگەی بازرگانی نێوان شام و یەمەنی بەڕێوە دەبرد، و سوودی لە پایە ئاینییەکەی وەردەگرت بۆ پاراستنی کاروانە بازرگانیەکان.[2]
بەڵام مەدینە کشتوکاڵ تێیدا لەبرەودا بوو بەهۆی باخی میوە و خورما و ترێوە.[3]

---

"الجزيرة العربية الحالة السياسية والاقتصادية عند ظهور الإسلام - موقع مقالات إسلام ويب" [1]

١. " [2]الجزيرة العربية الحالة السياسية والاقتصادية عند ظهور الإسلام - موقع مقالات إسلام ويب".

٢. مكة المكرمة قبل البعثة النبوية"
السيرة النبوية الصحيحة، أكرم ضياء العمري، بەرگی ١، لاپەڕە ٧٧-٨٢
" [3]الجزيرة العربية الحالة السياسية والاقتصادية عند ظهور الإسلام - موقع مقالات إسلام ويب".
السيرة النبوية الصحيحة، أكرم ضياء العمري، بەرگی ١، لاپەڕە ٧٧-٨٢





عەرەب دیناری بیزەنتی و درهەمی فارسییان بەکاردەهێنا لە ئاڵوگۆڕی بازرگانیدا، بەڵام لە ڕووی پیشەسازییەوە مەدینە ناسرابوو بە داڕشتنی جوانکاریی زێڕ و زیو، لەگەڵ دروستکردنی شمشێر و تیر و ڕم و زرێپۆش، هەروەها لە شارە عەرەبییەکاندا ئاسەنگەری و زەڕەنگەری و پێست خۆشکردن و چنین پەرەی سەند، هەروەها عەرەب چەند جۆرێک مامەڵەی داراییان دەزانی وەک قەرز و ڕەهن و باج.

ئەگەرچی دوورگەی عەرەب بێبەش بوو لەنیعمەتەکانی کشتووکاڵ و پیشەسازی ، بەڵام جێگا ستراتیژییەکەی لەنێوان ئەفریقاو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بواری بۆ ڕەخساندبوو ببێتە ناوەندێکی پێشکەوتوو لەبازرگانی نێودەوڵەتی لەوسەردەمەدا.

وە ئەوانەشی کە هەڵدەستان بە بازرگانی لەدانیشتوانی دوورگە خەڵکی شارەکان بوون بەتایبەت شاری مەککە،چونکە ناوەندێکی بازرگانی نایاب بوو،وە لەبەر ئەوەی ئەوان خەڵکی حەرەمی مەککە بوون پلە و پایەیەکی بەرزیان هەبوو لەلای هەموو عەرەب،بۆیە هیچ زیانێک نە بەخۆیان نە بەکاروانەکانیان نەدەکەوت.

خودای پەروەردگار دەفەرموێ : - **(أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا حَرَمًا ءَامِنٗا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنۡ حَوۡلِهِمۡۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَكۡفُرُونَ)**[1]

واتە:- ئایا کافرانی قوڕەیش نابینن ئێمە ئەو کەعبە پیرۆزمان لەوێ بۆ داناون کە بۆتە مایەی ئەمن و ئاسایش بۆیان [وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ] وە خەڵکی لە

---

[1] [سورة العنكبوت ٦٧]





دەوروبەری ئەوانەوە ئەڕفێندرێت و ئەدرێت بەسەریانداو ماڵ و سەروەت و سامانیان ئەبرێت، بەڵام ئەمان بەهۆی کەعبەی پیرۆزەوە پارێزراون [أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ] ئایا ئەوان بە شتی باتڵ و پووچەڵ باوەڕ ئەکەن [وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ (٦٧)] بەڵام کوفرانەی نیعمەتەکانی خوای گەورە ئەکەن بەسەریانەوە.

**هۆزی قوڕەیش دوو گەشتی گەورەیان هەبوو:**

-یەکێکیان لەزستان بۆ یەمەن.

-ئەوی تریش لەهاوین بۆ شام.

قوڕەیش زۆر بەئاسودەیی ئەم دوو کۆچەیان ئەنجامدەدا،لەکاتێکدا خەڵکی لەدەورووبەریاندا لەتەنگ و چەڵەمە و ناڕەحەتیدابوون.

باری کاروانەکان بریتی بوولە ( گوڵاو و دارعود و کەتیرە و بنێشت و بەهارات و خورما و بۆنی خۆش و کەڵبەی فیل و درەختی ئەبەنوس و موورو و پۆشاکی یەمەنی و ئاوریشمی چنراو و چەک و چەندین کاڵای تر).

لەکاتی گەڕانەوە بەباری گەنم و دانەوێڵە و مێوژ و زەیتون و جل و بەرگی شامی و شتی تریان دەهێنایەوە.

مامەڵەکردن بە سوو (زیادخستنەسەر)باو بوو لەدوورگەی عەرەبیدا،کەلەوانەیە ئەم دەردەکوشندەیە لەجولەکەکانەوە[1] گەشتبێتە عەرەبەکان،سەرگەورەکان و

[1] السيرة النبوية ،لابى شهبة(٦٠/١)





کەسانی تریش مامەڵەیان پێوەدەکرد،وە ڕێژەی سوو ەکەش جاری واهەبوو دەگەیشتە ڕێژەی سەد لەسەد.[1]
هەروەها عەرەب چەند بازاڕێکی بەناوبانگیان هەبوو،وەکو (عکاظ-مجنة-ذوالمجاز)،کە بازرگانیان لەو بازاڕانە ئەنجام دەدا.

## سێیەم : مەککە و نیمچەدوورگەی عەرەبی لەڕووی ئاینییەوە :

نەتەوەی عەرەب دەیاننالاند بەدەست دواکەوتنێکی کوشندە و بتپەرستییەکی چەپەڵی بێ وێنە و لادانێکی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و ئاژاوەیەکی سیاسی و یاسایی زۆر سەخت و نالەبار،لەم ڕووەوە پلە و پایەیان کەم و بێ بەها بوو،لەقەراغی مێژووەوە دەژیان،لەچاکترین حاڵەتەکانیاندا پاشکۆی دەوڵەتی فارسی یان ڕۆمانی بوون،دڵەکانیان پڕ لەمەزن ڕاگرتنی باوک و باپیرانییان بوو،هەمیشە شوێنی ئەوان دەکەوتن،هەرچەندە نوقمی گومڕایی و لادانیش بوونایە،هەر ئەو هۆکارەش بوو ڕێگای خۆشکرد بۆ بتپەرستی.[2]
لە ڕووی ئایینییەوە، بت پەرستی نیمچەدوورگەی عەرەبی گرتبوویەوە بە شێوەیەکی گشتی[3]،کۆمەڵە خواوەندێکیان دەپەرست دروست کرابوون لە بەردو تەختە، ژمارەیان دەگەیشتە ٣٦٠ بت لە دەوری کەعبە، ئەو هۆزانە دەیانپەرستن کە دەهاتن بۆ حەج و قوربانی و نەزریان بۆ دەکردن[4].

---

[1] دراسة تحليلية لشخصية الرسول (ل.١٩)
[2] صەلابی
[3] الرحيق المختوم، المباركفوري، ص٢٠-٢٥
[4] الجزيرة العربية الحالة السياسية والاقتصادية عند ظهور الإسلام - موقع مقالات إسلام ويب





گەورەترینیان کۆنترینیان بتی (هوبەل) بوو کە قورەیش و کینانە دەیانپەرست هەروەها بتی (عووزا) شیان دەپەرست، و بتی (مەنات) هوزەیل و خوزاعە دەیانپەرست، هۆزی سەقیف بتی (لات) یان دەپەرست[1].

لەگەڵ ئەمانەشدا چەند دروشمێکیان لە پاشماوەی ئایینی ئیبراهیم بۆ مابوویەوە وەک بەرز ڕاگرتنی کەعبە، و سەردان کردنی، و حەج و عومرە، لە هەمان کاتدا چەند تاکێک هەبوون کە لەسەر ڕێبازی ئیبراهیم و ئیسماعیل بوون بە تەنها و ناسرابوون بە حەنەفییەکان[2].

هەروەها چەند ئایینێکی تر هەبوو بەشێوەیەکی دیاریکراو وەک جوولەکە لە یەمەن و مەدینە، و مەسیحییەت لە نەجران و حیرە و دەوروبەری شام، و هەروەها بڵاوبونەوەیەکی دیاریکراوی ئاگرپەرستی هەبوو کە لە ئێرانەوە هاتبوون[3].

ئەم بتپەرستیە ئەم بیرە بۆگەنە بووبوە پەرژینێک لەنێوان خەڵک و ناسینی تەواوەتی خودای گەورەو باوەڕ پێهێنانی و باوەڕ بوون بەڕۆژی دوایی،ئەگەر چی ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کەئەم بتانە هۆکار گەلێکن لەنێوان ئەوان و خودا و نزیکیان دەخەنەوە لەخودا،بۆیە ئەو بتانە بەتەواوی زاڵ ببوونەسەر دڵەکانیان و هەموو کاروباری لایەنەکانی ژیانیاندا.

سەبارەت بەو پاشماوانەی کەمابوو لە دینی ئیبراهیم ( علیەالسلام)ئەویش گۆڕان و تێکدانی بەسەردا هاتبوو.

---

[1] المفصل في تاريخ العرب قبل الإسلام، بەرگی ١١، لاپەڕە ٢٥٣

" [2] تجلّيات «الحنيفية» في مكة قبل الإسلام" *www.makkawi.com* .

" [3] الجزيرة العربية الحالة الدينية عند ظهور الإسلام - موقع مقالات إسلام ويب"





کەسانێك لە حەنیفییەکان مابوون کە بە بتپەرستی و ئاژەڵ سەربڕین بۆ بتەکان و ڕێوڕەسمەکان ڕازی نەبوون و گۆشتی ئاژەڵی مرداربوو و خوێنیان نەدەخوارد.

## چوارەم : مەککە و نیمچەدوورگەی عەرەبی لەڕووی کۆمەڵایەتی و نەریتەوە:

### ١-: لەڕووی کۆمەڵایەتی و هاوسەرگیرییەوە:

عەرەبەکان چەندین جۆر پەیوەندی سێکسییان باس کردووە، کە هەموویان پەیوەندی نێوان نێر و مێ دەردەخەن، کە مێژووی پێش ئیسلام ئەم بابەتەی تۆمارنەکردووە،بەڵام بە گوێرەی ئەوەی ماوەتەوە بۆمان لە شیعرو ڕووداوە جیاوازەکان، بابەتی هاوڕەگەزبازی لەناو نیوە دوورگەی عەرەبیدا، یان لانی کەم لەناو ناوادارەکانی تیرەو تایەفەکانی عەرەب، سەرباری هەندێ لێکۆڵینەوە کە ئاماژەن بۆ بوونی ئەم جۆرە پەیوەندییە سێکسییانە لەلایەن عەرەبەکانەوە پێش هاتنی ئیسلام دەکەن،وەچەند شێوازێکی هاوسەرگیری لەناویاندا هەبوو.

**ئەو شێوازە هاوسەرگیرییانەی زۆر بەناوبانگ بوون ئەمانەن:**

**یەکەم :** هەمان ئەو هاوسەرگیریەیە کە ئێستا کەناو خەڵکیدا بەربڵاوە.

دووەم: (الاستبضاع): ئەم شێوازە ئەوەیە پیاوێک واز لەژنەکەی بهێنێت بۆ پیاوێکی تر،لەگەورە و خاوەن پێگەی هۆزەکە وەک شاعیر یان ئەسپ سوارە یان خاوەن



پلەو پایەی بەرز، ئەوکەسە ژنەکە مارەدەبڕێت و کاتێ دوگیان دەبێ لێی،دەگەڕێتەوە بۆلای هاوسەرەکەی .

ئەم کارەیان بۆ ئەوە دەکرد تا منداڵیان لەچینی باڵا هەبووایە.لەڕووی پێگە و دەسەڵات یان هێزی پیاوەتی یان هەر بەهەرەیەک هەبوایە لەپیاوێک تا منداڵەکەی ئەوانیش ئاوای لێ دەربچێت.

**سێیەم**:(المخادنه): موخادەنە بەواتای هاوڕێیەتی یان دۆست، ئەمەش ئەو جۆرەیە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە کە دەفەرموێت (ولا متخذات اخدان).

هەندێک لەژنەکان پێش هاتنی ئیسلام هاوڕێیەکی دیکەی هەبوو جیا لەهاوسەرەکەی و پەیوەندی لەگەڵ دەبەست، بۆچوونی جیاواز هەیە لەبارەی (موخادەنە) پێش هاتنی ئیسلام و تەنانەت دوای ئیسلامیش، وتراوە کە (موخادەنە) ناگاتە گرێبەستی هاوسەرگیری، بۆیە بابەتەکە تەنها بە ماچ و باوەش پێداکردن کۆتایی دێت، کە وتراوە ئەوەش گرێبەستی هاوسەرگیریە.

هەروەها جیاوازی بۆچوون هەیە لەبارەی ئەوەی کە ئەو پەیوەندییە بەشێوەی نهێنی بووە یان حاڵەتێکی باوی پەیڕەوکراو، هەرچەندە زۆربەی بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەپەیوەندیەکی نهێنی بووە.

**چوارەم** : (البدل) بەدەل: ئەمەش ئەوەیە دوو پیاو هاوسەرەکانیان دەگۆڕنەوە، بۆ ماوەیەکی کاتیی لەپێناو چێژوەرگرتن و گۆڕیندا،بەبێ ڕاگەیاندنی جیابوونەوە یان گۆڕینی گرێبەستی هاوسەرگیری.

قسەیەکی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) هەیە لەو بارەیەوە دەڵێت:"بەدەل سەردەمی نەزانی (جاهیلی) واتە پێش ئیسلام ئەوەیە کە پیاوێک وتوویەتی بە





پیاوێک، دەستبەرداری ژنەکەت بە بۆمن، منیش دەستبەرداری ژنەکەی خۆم دەبم بۆت،یان زیاترت دەدەمێ.

**پێنجەم :** (المضامدة) موزامەدە: ئەمەش ئەوەیە کە ژنێک جیا لەهاوسەرەکەی پەیوەندی لەگەڵ پیاوێک یان دوو پیاوی تر هەبێت، لە فەرهەنگە زمانەوانیەکاندا، (زەماد) بەواتای ئەوە دێت کە ژنێک لەگەڵ دوو پیاو یان سێ پیاو پەیوەندی هەبێت، بۆ ئەوەی نان خۆری هەردوولا بێت و لەکاتی قات و قڕیدا، وادەردەکەوێت کەئەم جۆرە پەیوەندییە زۆر خوازراو نەبووبێت، تەنانەت عەرەبەکان وەک ناپاکی ئافرەت ئەژماریان کردووە، ئەگەر چی وەک دیاردەیەک هەبووە و بەربڵاویش بووە، (ئەبو زوئەیلی) کە یەکێکە لە شاعیرە بەناوبانگەکانی سەردەمی گومڕایی لە شیعرێکدا دەڵێت:

**دەتەوێت من و خالید بەیەکەوە کۆبکەیتەوە**

**ئایا دوو خەنجەر لە کێلانێکدا جێگای دەبێتەوە**

دەگێڕنەوە کە ئەم شیعرەی پێشووی بەو مەبەستە نوسیوە، کە ژنەکەی لەگەڵ ئامۆزایەکیدا بینیوە کە ناوی (خالیدی کوڕی زوهەیر) بووە. وا دیارە کە (هەزلی) ئەم پەیوەندییەی بە قێزەون زانیوە و وتویەتی، من ئەوجۆرە پەیوەندییەم پێ قێزەونە، وە لەبارەی ئەو ڕووداوەی خێزانەکەشیەوە دەڵێت:"ئەتەوێت من و هاوڕێکەم هەردوکمان لەباوەش بگریت، دەی کەواتە برۆ بۆ لای ئەو و من بەجێبهێڵە ."

**شەشەم: (ڕەهط):** ئەمەش ئەو جۆرەیە کە ١٠ پیاو لەگەڵ ژنێک هاوسەرگیری دەکەن، وە کاتێ کە دوگیان دەبێت دەنێرن بەشوێن هەموویاندا، پاشان ژنەکە





لەناویاندا دەیگوت : خۆتان دەزانن لەنێوان من و ئێوەدا چ پەیوەندییەکمان هەبووە،ئێستاش من منداڵم بووە لە (فڵانی کوڕی فڵان) ناوی پیاوێکی دەهێنا بەئارەزووی خۆی و دەیگوت تۆ باوکی ئەویت،پیاوەکەش نەیدەتوانی نکۆڵی بکات و منداڵەکە ئیتر بەناوی کوڕی ئەو پیاوەوە بانگ دەکرا.

**حەفتەم: (ئەسحابولرایات)** :واتە خاوەن بەیداخەکان: ئەمانە دەتوانین بە (داوێن پیسەکان)یان (لەشفرۆشەکان) ناوزەدیان بکەین، ئەمڕۆ بەو ناوە دەناسرێت، هەر ژنێک لەوانە بەیداخ بەرز بکاتەوە (دەوترێت کە بەیداخەکە ڕەنگی سوور بووە) ئاماژەیەک بووە بۆئەوەی ئەو ژنە ئامادەبووە بۆ ئەوەی پیاوان بچنەلای.

**هەشتەم** : هەندێ پەیوەندی سێکسی هەبوو بەزەبری شمشێر ئەنجام دەدران،بۆ نمونە دوو تیرە بەشەڕ دەهاتن،تیرە و هۆزی براوە ژنانی تیرەو هۆزی دۆڕاویان دەهێنا و خۆیان دەکردە خاوەنیان و بەبێ هیچ سڵەمینەوەیەک سەرجێییان لەگەڵ دەکردن،هەر منداڵێك لەم سەرجێیی کردنە لەدایک بووایە تا کۆتایی تەمەنیان ئەم حەیاچوون و شەرمەیان لەگەڵ دەبوو.

**نۆیەم : نکاح الشیغار** : کەسێك کچەکەی خۆی لەوی تر ماردەکرد بەمەرجێك ئەویش کچەکەی خۆی لە ئەو مارەبکات،بەبێ مارەیی[1]

**دەیەم** : لەنەریتی کۆمەڵایەتی سەردەمی نەزانیدا پیاو چەند ژنی ویستبا دەیتوانی بیهێنێ،وە دەیتوانی دوو خوشک لەیەک کاتتدا مارەبکات،دەیتوانی ژنی باوکیان دوای تەڵاق یان مردنی باوکیان لەخۆیان مارەبکەن و هیچ سنوورێك نەبوو لەبەردەمیان.

---

[1] السیرة النبویة،لابی شهبة ( ٩/١)





تا ئیسلام هات و قەدەغەی کرد وەک خوای پەروەدگار دەفەرموێت : - ((وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا
۞ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ ۚ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا))[1]

واتە:- ئێوە نەکەن باوەژنی خۆتان مارە بکەن چونکە تەنها بە مارەبڕینی لە باوکتان لە ئێوە حەرام دەبێت، ئیلا ئەوەی لە پێشترو لە کۆندا ڕوویداوە ئەوە خوای گەورە سزاتان نادات بەڵام لەمەودوا حەرامە [إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاءَ سَبِيلًا (٢٢)]

---

[1] [سورة النساء ٢٢ – ٢٣- ٢٤]



بە دڵنیایی ئەمە فاحیشەیەو بەزینا حیسابەو مارەی نایات وە شتێکی ڕق لێبوو بوغزێنراوە وە خراپترین ڕێگاو کارە کە مرۆڤ باوەژنی خۆی مارە بکاتەوە.
]حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ] خوای گەورە ئەمانەی لێتان حەرام کردووە: دایکتان وە نەنکتان وە تا بەرەو سەرەوە بڕوا [وَبَنَاتُكُمْ] وە کچتان وە کچی کچتان تا بەرەو خوارەوە بڕوا [وَأَخَوَاتُكُمْ] وە خوشکتان [وَعَمَّاتُكُمْ] وەخوشکی باوکتان (پور) [وَخَالَاتُكُمْ] وە خوشکی دایکتان (میمك) [وَبَنَاتُ الْأَخِ] وە کچی برا (برازا) [وَبَنَاتُ الْأُخْتِ] وە کچی خوشك (خوشکەزا) [وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ] وە ئەو دایکانەی کە شیریان پێتان داوە ئەویش دەبێ بەدایکتان بەمەرجێك تەمەنتان دوو ساڵ کەمتر بێت و پێنج جار تێر شیرتان خواردبێ [وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ] وە خوشکی شیریتیان [وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ] وە دایکی خێزانەکانتان (خەسو) [وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ] وە ئەگەر بێوەژنێکت هێناو گواستتەوەو کچی هەبوو ئیتر کچەکەی بۆ هەمیشەیی لێت حەرام ئەبێ، ئیتر ئەو کچە تۆ بەخێوی بکەی کە زیاتر وابووە یان بەخێویشی نەکەی [فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ] بەڵام ئەگەر هاتوو ئافرەتە بێوەژنەکەت مارە بڕی و نەتگواستەوەو تەڵاقتداو پاشان کچەکەیت هێنا ئەوە دروستە مادام نەتگواستۆتەوە [وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ] وە ژنی کوڕەکەتان (بووکتان) ئەو کوڕەی کە لە پشتی خۆتە ئەویش لێتان حەرامە تەنها مارەی بکات ئیتر لێتان حەرام ئەبێ، نەك وەکو لە سەردەمی نەزانیدا کوڕی خەڵکتان ئەکرد بە کوڕی خۆتان بە (تەبەنی) [وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ] یاخود ئەگەر بێتوو دوو خوشك بەیەکەوە مارە بکەن ئیلا ئەگەر لە سەردەمی نەزانیدا کردبێتتان





خوای گەورە لێتان ناگرێ پێش ئەوەی کە حەرام بێت کە خەڵکی سەردەمی نەفامی دەیانکرد خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند [إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا (٢٣)] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەڕەحم و بەزەییە .

[وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ] وە ئەو ئافرەتانەتان لێ حەرامە کە مێردیان هەیە هێشتا مێردەکەی تەڵاقی نەداوە یان تەڵاقی داوەو هێشتا عیددەی تەواو نەبووە ئیلا ئەوەی کە جاریەو کەنیزەیە و ئافرەتی کافران کە لە جەنگدا بە دیل ئەگیرێن حەڵاڵن بۆتان [كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ] ئەمە حوکمی خوای گەورەیە بۆ ئێوەی داناوەو نابێ بیگۆڕن [وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ] جگە لەمانەی کە باسمان کرد خوای گەورە ئافرەتانی تری بۆتان حەڵاڵ کردووە [أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ] بەوەی کە بەماڵی خۆتان مارەیی بدەن بەو ئافرەتانەی کە ئەیانهێنن [مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ] وە بۆ ئەوەی کە خۆتان داوێن پاك بکەن و خۆتان بپارێزن لە زینا کردن [فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً] ئەوەندەی کە سوودتان لەو ئافرەتانە بینی بەجیماع کردن و نزیك بوونەوەو نیکاحی شەرعی ئەوا مارەیی خۆیانیان بدەنێ، وە وتراوە: (فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ) مەبەست پێی موتعەیە کە لەسەرەتای ئیسلامدا حەڵاڵ بووە پاشان نەسخ بۆوە کە فەرموودەکە لە بوخاری و موسلیم هاتووە ئیمامی عەلی گێڕاویەتیەوە: (أَنَّ النَّبِيَّ- صلى الله عليه وسلم - نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ) (البخاري (٥١١٥) مسلم (١٤٠٧)) پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - نەهی کرد لە نیکاحی موتعەو سیخە وە لە گۆشتی گوێدرێژی ماڵی لە غەزای خەیبەردا [وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُمْ بِهِ مِنْ





بَعْدِ الْفَرِيضَةِ] وه لە دوای دەستنیشان کردنی مارەییش گوناهبار نابن ئەگەرلە نێوان خۆتاندا ڕێ بکەون ئایا زیاتری ئەدەیتێ یان بۆت ئەگەڕێنێتەوە لە دڵەوە دەرچێت [إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا (٢٤)] بەڕاستی خوای گەورە زۆر زاناو کاربەجێیە.

ئەم جۆرانەی باسمان کرد، لە بەناوبانگ ترین پەیوەندییە هاوسەرگیریەکانی پێش ئیسلامن، کە جیاوازە لەو هاوسەرگیریەی کە دواتر ئیسلام بڕیاری لێداوە ناسراوە بە بوونی شایەت و گرێبەست[1] .

**٢-جیابوونەوە :**

لەو سەردەمانە تەڵاقیان ئەنجام دەدا،بەبێ سنورێکی دیاریکراو،بۆنمونە پیاوێك هاوسەرەکەی خۆی تەڵاق دەدا و دەیگێڕایەوە ،تەڵاقی دەدا و دەیگێڕایەوە و بەبەردەوامی ئەو شێوازە پەیڕەو دەکرا،تاهاتنی ئیسلام.[2]

**٣-زانست و خوێندنەوە:**

عەرەب مەگەر ژمارەیەکی کەم نەبێ ئەگینا بەشی زۆری وەکو یەهودی و نەسرانییەکان خاوەنی نوسین و زانست نەبوون،بەڵکو بەشی زۆری نەفام و نەخوێندەوار بوون،عەرەب نەنوسین و نەژماردنیان نەدەزانی ئەوەش خەسڵەتێکی زاڵبوو بەسەریاندا،بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەوان بانگی ژیری و هۆشمەندی و

---

[1] الرحيق المختوم

سایتی پەیسەر

[2] دراسة تحليلية لشخصية الرسول (ل/ ٢٥ )





ئامادەباشی زانستییان هەبوو،بۆیە کە ئیسلام هات بوونە دانا و زانا و ڕزگارییان بوو لەنەخوێندەواری[1] .

## ٤-لەڕووی ڕەوشت :

عەرەب لەڕووی ڕەوشتەوە خراپ بوون،شەیدای مەی و قومار بوون،زۆرکاتیش خەریکی پەلاماردان و ڕێگە بەکاروان گرتن و دەمارگیری و ستەم و خوێن ڕشتن و تۆڵەکردنەوە و ماڵی خەڵک زەوتکردن و ماڵی هەتیو خواردن و مامەڵەکردن بەسوو و دزی و داوێن پیسی و بوون.[2]

بەڵام هەموو بەمشێوەیە نەبوون زۆرێك لەئەوان دووربوون لەداوێن پیسی و ئەو ڕەفتارانەی لەسەرەوە باسکرا،وە هەندێك خەسڵەتی باشیشیان هەبوو کە ئامادەی کردن بۆ هەڵگرتنی ئاڵای ئیسلام،لەوانە :

-ژیری و زرنگی

-بەخشندە و دەست بڵاو بوون.

-نەبەرد و خاوەن پیاوەتی و فریاکەوتن بوون.

-حەوداڵی ئازادی بوون و ستەم و سەرشۆڕییان قبوڵ نەبوو.

-بە ئەمەک بوون بۆ پەیمان و خۆشەویستییان بۆ ڕاشکاوی و ڕاستگۆیی.

-ئارامگرتن لەسەر نارەحەتی و خۆڕاگری و ڕازیبوون بەکەم.

-هێزی لاشە و گەورەیی دەروون و دڵخۆشبوون لەکاتی بەهێزیدا .

-پاراستنی دراوسێ.

---

[1] دراسة تحليلية لشخصية الرسول (٩٢/١)
[2] دراسة تحليلية لشخصية الرسول (٩٤/١)





### ٥- لەڕووی نەریتی کچ زیندەبەچاڵ کردن و کوشتنی کوڕ لەترسی هەژاری :

نەریتی زیندەبەچاڵکردنی کچ لەناو عەرەبدا باو بوو،کچان و ئافرەتان پێگەیان لاوازبوو لای پیاوان،بەجۆرێک کاتێک بە پیاو دەگوترا کچێکتان لەدایک بوو ڕەنگی ئەو پیاوە ڕەش هەڵدەگەڕا و شەرمەزاری دایدەگرت.

بۆ کوڕانیش پیاوانێك هەبوون لەترسی نەبوونی خانوو و خواردن و بەخێوکردن منداڵەکانیان دەکوشت.

تا ئیسلام هات و ئایەت دابەزی،وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێت :- (وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ۝ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ)[١]

واتە:- وە کاتێك یەکێك لەوان موژدەی پێ بدرایە کە خێزانەکەت مناڵی بووەو کچی بووە [ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا] بە بەردەوامی و بە درێژایی ڕۆژ ڕەنگی ڕەش هەڵئەگەڕا لە خەفەتدا [وَهُوَ كَظِيمٌ (٥٨)] وە غەم و خەفەتی خۆی ئەخواردەوەو دەرینەئەبڕی کە چەندێك خەفەتبار ئەبوو .

[يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ] لەناو قەومەکەیدا لەناو خەڵکیدا خۆی ئەشاردەوەو شەرمی ئەکرد لە خراپی ئەو موژدەیەی پێی دراوە کە تووشی چ عەیب و عارێك بووە کە کچی بووە [أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ] نەی ئەزانی ئایا ئەبێت ئەم کچە

---

[١] [سورة النحل ٥٨ - ٥٩]





بهێڵێتەوەو دواتر ببێتەهۆی سەرشۆڕی ئەو( لای ئەوان مانەوەی کچ و بەشوودانی سەرشۆڕی بووە و کچەکەیشیان سەرشۆڕ کردووەو بایەخ و میراتیان پێ نەداوە) [أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ] یاخود بیشارێتەوە لەناو خۆڵداو زیندەبەچاڵی بکات وەکو هەندێك لە عەرەب وایان ئەکرد [أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ (٥٩)] بەڕاستی خراپترین بڕیار بوو کە ئەیاندا سەبارەت بە کچانیان.

(۞ قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْۖ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔاۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًاۖ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْۖ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ)[١]

واتە:- ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: وەرن با من پێتان بڵێم و بۆتان بخوێنمەوە ئەو شتانەی کە پەروەردگار لەسەر ئێوەی حەرام کردووە نەك خۆتان لە خۆتانەوە شت حەرام بکەن [أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا] لە هەموو شتێك گەورەتر کە خوای گەورە لەسەری حەرام کردوون ئەوەیە هیچ جۆرە شەریکێك بۆ خوای گەورە بڕیار مەدەن، ئێوە شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار ئەدەن بەڵام لەولاوە ئەوەی خوا حەڵاڵی کردووە لەسەر خۆتانی حەرام ئەکەن، ئەگەر لە ڕۆژی قیامەت بە پڕایی زەوی بە تاوانەوە بگەیت بە خوای گەورەو شەریکت بۆ بڕیار نەدابێت ئەوا خوای گەورە بە پڕایی زەوی بە لێخۆشبوونەوە بۆت دێت و لێت خۆش دەبێت

[١] [سورة الأنعام ١٥١]



[وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا] وە چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا ئەگەر کافریش بن [وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ مِنْ إِمْلَاقٍ] وە منداڵی خۆتان مەکوژن لەبەر فەقیری و هەژاری، کە هەندێکیان کوڕیان لەبەر هەژاری و کچیان لەبەر شەرمەزاری زیندەبەچاڵ دەکرد [نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ] ئێمە ڕزقی ئێوەو ئەوانیش ئەدەین [وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ] وە نزیکی فاحیشەو بەدڕەوشتی مەکەونەوە وەکو زینا ئەوەی ئاشکرایەو ئەوەی نهێنیەو خۆتانی لێ دووربخەنەوە [وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ] وە ئەو نەفسەی کە خوای گەورە حەرامی کردووە بیکوژن ئێوە مەیکوژن ئیلا بەحەق نەبێ وەك ئەوەی کەسێکی بەناحەق کوشتبێ ئەبێ بکوژرێتەوە، یان لە دوای زەواجێکی شەرعی زینا بکات ئەبێ بکوژرێتەوە، یان لە دین هەڵگەڕێتەوە ئەبێ بکوژرێتەوە، بەڵام ئەمانەش حاکمی موسڵمان ئەیکات نەك تاك تاکەی خەڵکی [ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (١٥١)] ئا ئەمانە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەرتان و فەرمانی پێ کردوون و ئامۆژگاری کردوون بەڵکو عاقڵ بن و فێر بن و شت وەربگرن.

لەڕاستیدا ناتوانرێت بگوترێت کوڕ کوشتن نەریتێکی باو بووە،چونکە گەلی عەرەب هەموو کات زیاتر تا لەکاتی شەڕدا کوڕان بچن بجەنگن.





**سەرنج:**

دۆخی کۆمەڵایەتی عەرەب لەخراپترین دۆخی ژیانیان دا بوون،نەزانی و نەریتی پوچ و بێبنەما هەمووانی مەست کردبوو.

ژنان چەشنی کاڵای بێگیان و دڵ مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا و گەورەکانیش هەر لەخەمی پڕکردنی قاسە و کاسە دابوون لەسەر حسابی خەڵکی بێ دەسەڵات.

## کاربەدەستانی ماڵی خودا:

ئاشکرایە کەعبە لەلایەن ئیبراهیم ( علیه السلام ) و ئیسماعیل دروست کراوە.

دوای ئەوە ئیسماعیل سەلامی خوای لێبێت کاروباری کەعبەی بەدەستەوە گرت،دوای وەفاتی نابت کوڕەکەی ئەو شەرەفەی وەرگرت،دوای ئەو کاروبار کەوتە دەست ( مضاض )ی کوڕی عەمری جورهەمی کەباوکی دایکی بوو،واتە خەزووری ئیسماعیل بوو،دوای ئەوانە چەندین دەستی جیاوازی کرد، تا کەوتە دەستی عەبد موتەڵیب.

عەبد موتەڵیب ئەرکی خزمەتکردنی کەعبە و نان دان و ئاو دانی حاجییانی کەوتە ئەستۆی،بەڵام ئاو دان بەحاجییان عەبد موتەڵیبی ناڕەحەت کردبوو چونکە ئاو لەمەککە کەم بوو و بیرەکانی زەم زەم ووشکی کردبوو،بۆیە ناچار بوو لەدەرەوەی مەککە ئاوبێنێ و بیکاتە چەند حەوزێکی دەورووبەری کەعبە.

عەبد موتەڵیب لەبیری دابین کردنی ئاو بوو خوای گەورە چەندجارێک لە خەویدا شوێنی ئاوی زەمزەمی پێ نیشاندەدات،ئەویش ئەو شوێنەی پێ نیشاندرابوو چووە



ئەوێ و دەستی بەهەڵکۆڵین کرد،سەرەڕای دروستکردنی کێشە لەبەردەمی بەڵام کۆڵی نەدا و بووە خاوەنی ئاوی زەمزەم.

دوای عەبد موتەڵیب ( سقایە ) کەوتە دەستی ئەبو طالیب،بەڵام ئەبوو طالیب دەستی کورت بوو توانای بەڕێوەبردن و خزمەتکردنی نەبوو بۆیە دایە دەستی عەبباس،دوای عەبباس کەوتە دەست عبداللّٰەی کوڕی،پاشان عەلی کوڕی عبداللّٰه،پاشان داودی کوڕی عەلی ،پاشان سولەیمانی کوڕی،پاشان خەلیفە مەنصوور گرتییە دەست و ئەبو رەزینی خزمەتگوزاری کردە سەرکاری ، پاشان زەمانە هات و چوو ئەم کارە مەردانە پڕ شانازییە لەدەست چوو.[1]

## نەزری سەربڕینی کوڕێک :[2]

عەبد موتەڵیب لەبەر ئەوەی کوڕی کەم بوو تووشی چەرمەسەری و نارەحەتی زۆر دەهات لەلایەن عەرەبەکانەوە تەنانەت هەندێک جار لەسەر قاچ ڕاکێشانێک دەیانگوت چۆن ئەوەندە قاچ ڕادەکێشیت لەکاتێکدا تۆ تاقە کوڕێکت هەیە و کوڕی ترت نییە لەدەورتدا.

بۆیە ئەم قسە و کردارانەی بەرامبەری دەکرا کاری کردە سەر دڵی عەبد موتەڵیب و داوای لەخوا کرد دە کوڕی پێببەخشێت و نەزری کرد یەکێ لەکوڕەکانی بۆ خوا سەربڕێت.

[1] السيرة النبوية لابى شهبه :١/١٥٣-١٥٤
[2] ژیانی ئازیزمان.





دوای ئەوەی خوای گەورە دە کوڕی پێدەبەخشێت و گەورەدەبن،دوای ئەوە باسی نەزرەکە بۆ کوڕەکانی دەگێڕێتەوە،بۆیە فەرمانیان پێدەکات هەریەکەیان لەسەر تیرێك ناوی خۆی بنوسێت و بۆی بێنن،ئەوانیش فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد.

ئەویش چووە ناو کەعبە بۆ لای هوبەل،فەرمانی بە خزمەتکاری هوبەل دا قورعەکەی بۆ بکات و وناوێکی بۆ هەڵبژێرێت.

عەبد موتەڵیب عبداللە ی لەهەموان خۆشتر دەویست نەیدەویست تەنها ناوی ئەو دەرچێت،کەچی لەگەڵ ڕاکێشانی یەکەم ناو ناوی عبداللە دەرچوو.

کاتێ ویستی نەزرەکە جێبەجێ بکات،خێرا خاڵوانی کوڕەکە گوتیان : بەخوا سەری نابڕیت و چارەیەکی بۆ بدۆزەرەوە،گەر فیدیە و سامانی ویست بۆی دەدەین .

عەبد موتەڵیب دەنێرنە لای ئافرەتێکی کاهین تا ڕێگەچارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە کەلەخەیبەر ئەم ئافرەتە دەدۆزێتەوە و باسەکەی بۆ دەگێڕێتەوە ئافرەتەکەش داوای مۆڵەت دەکات بۆ بەیانی تا وەڵامیان بداتەوە.

بەیانی ئافرەتەکە دەڵێ : هەواڵم بۆ هاتووە...لای ئێوە خوێنی پیاوو چەندە؟ دەڵێن : دە وشتر.

دەڵێت: بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان کوڕەکەتان بێننە پێشەوە و دە وشتریش بێننە پێشەوە پاشان تیروپشک بکەن گەر ناوی کوڕەکە دەرچوو دە وشتری تر زیاد بکەن ،بەمشێوەیە دە زیادبکەن تا ناوی وشترەکان دەردەچێت.

کە گەڕایەوە مەککە عبداللەی هێنایەپێش لەگەڵ دە وشتر.لەگەڵ هەر تیروپشکێک ناوی عبداللە دەردەچوو تاگەیشتە سەد وشتر ئەوکات ناوی وشترەکان دەرچوو،عەبد موتەڵیب سێ جار دووبارەی کردەوە هەر ناوی وشترەکان



دەردەچوو،ئینجا گوتیان خوای گەورە ڕازی بووە و سەری وشترەکانیان بڕی لەبری عبدالله.

## ژن هێنانی عبدالله :

عبدالله گەنجێکی جوان و خاوەن لەش و لارێکی ڕێک و بەهێزبوو،بۆیە چەندین ئافرەتی قەشەنگ بەو هیوایەبوون ببنە هاوسەری.

عەبد موتەلیب ئامینەی کچی وەهبی بۆ دەستنیشان دەکات و لەگەڵ عبدالله بەڕێ دەکەون بۆ داواکردنی ئامینەخان کە ئەوکات لەهەموو ڕوویەکەوە کچی تاقانەی قورەیش بوو.

لەڕێگادا ئافرەتێك بەلایاندا تێدەپەڕێت،هەندێك کەس دەڵێن قوتەیلەی خوشکی وەرەقەی کوڕی نەوفل بووە،بەشێکی تر دەڵێن فاطمەی کچی موڕی خەثعەمی بووە،کە ئافرەتێکی جوان و پاك داوێن بووە،ئەو ئافرەتە نورێك لە نێوچەوانی عەبدالله بەدی دەکات،بۆیە خۆی پێناگیرێت و داوای هاوسەرگیری لە عبدللە دەکات،بەڵام عبدالله ڕەتی دەکاتەوە و قەدەری خوا وەهابوو کە ئەو نورەی بە ئامینە بەخشی.

جارێکیان لەخەویدا ئامینە ئەوەی بینی لە خەویدا نورێکی لێهاتەدەرەوە و هەموو سەرزەوی ڕووناک کردەوە و کۆشکەکانی بوشراش لەشام پێی دەرکەوتن.

عبدالله ماوەیەکی کورت لەگەڵ ئامینەی خێزانی دەبێ بەمەبەستی بازرگانی ڕوو لەشام دەکات،کاتی گەڕانەوەی سەرێك لە خاڵوانی باوکی دەدات لە یەثریب،بەڵام





عبداللە لەوێ نەخۆش دەکەوێت و وەفات دەکات، کە ئەوکاتە کۆرپەکەی ئامینە دوو مانگ دەبێ لەسکیدا.

## سوپاکەی ئەبرەهە :

ئەبرەهە پادشای یەمەن بوو،کاتێ بینی خەڵکی بەلێشاو ڕوو لەکەعبە دەکەن ،ڕقی هەڵسا و گوتی من ماڵێکی چاکتر دروست دەکەم تا خەڵکی بێن و ڕوو لەو ماڵە بکەن و واز لەکەعبە بهێنن.

ئەوەبوو لە صەنعای پایتەختی یەمەن دەستی دایە دروستکردنی کەنیسەکەی گەورە و ئەوپەڕی کەل و پەلی بەنرخی تێدا بەکارهێنا و ناوی نا " قولڵەیس ".

بەڵام پێچەوانەی حەزی ئەبرەهە کەس نەدەچوو بۆ ئەوکەنیسەیە،بۆیە ڕقی هەڵسا و بڕیایدا کەعبە بڕوخێنێ تا خەڵکی بەناچاری ڕوو لەو کەنیسەیە بکەن.

بۆیە سوپایەکی بەهێز و گەورە کۆدەکاتەوە کە ژمارەیان ٦٠ هەزار سەربازدەبێ و نۆ یان سیانزە فیل یان لەگەڵ دەبێ،ئەو سوپایە نەخەڵکی مەککە و نە عەرەب توانای ڕاگرتن و ڕووبەڕووبوونەوەی نەبوو.

کاتێک ئەبرەهە و سوپاکەی دەگەنە نزیک مەککە ،ڕانە وشترێکی عەبد موتەڵیب دەکەوێتە بەردەستیان،بۆیە عەبد موتەڵیب دەچێتە لای ئەبرەهە و داوای وشترەکانی لێدەکاتەوە،ئەبرەهەش سەری سوڕ دەمێنێ و دەڵێ تۆ هاتووی داوای وشتر دەکەیت بەڵام داوا نەکەیت کەعبە نەڕوخێنم؟ کە مایەی سەربەرزی و پایەداری خۆت و باپیرانتە؟



لەوەڵامدا بەیەک ڕستە عەبد موتەڵیب وەڵامێکی بەهێز و عەقیدەیی و مێژوویی دایەوەو گوتی:(من خاوەنی وشترم و ماڵی خوداش خاوەنەکەی دەیپارێزێت) ، خاوەنەکەی مەبەستی خوا خۆی دەیپارێزێت نەک من.

عەبد موتەڵیب گەڕایەوە و لەگەڵ چەند پیاوێکی قوڕەیش کۆبونەوە و زانیان هیچیان بۆ ناکرێ بەرامبەر ئەو سوپایە،بڕیاریان دا دەست بە ئەڵقەی دەرگای کەعبەوە بگرن و لەخوای گەورە بپاڕێنەوە تا خۆی ماڵەکەی خۆی بپارێزێت،دواتر شاری مەککە چۆڵ کرا لەترسی زیان گەیاندنی ماڵ و منداڵەکەشیان.

ئەبرەهە هات تا گیشتە دۆڵی " محسر" ی نێوان موزدەلیفە و مینا،لەوێ فیلەکەی چۆکی دا و هەڵنەستایەوە تا بەرە و کەعبە بڕوات،فیلەکەی بەشێوەیەک بوو ڕووی لەهەرلا کردبا دەڕۆیی بەڵام بۆ کەعبە هیچ هەنگاوێکی نەدەنا،ئەمە نیشانەیەکی گەورەبوو بۆ ئەبرەهەی صەلیبی بەڵام خۆی کەڕ و کوێر کرد و لەکارەکەی پاشەکشەی نەکرد.

لەولا قوڕەیشییەکان تەپەی دڵیان دەهات و لەملاش کەعبە لەمەیدانێکی فراواندا وەک پاڵەوان بەرامبەر سوپایەکی گەورە وەستابوو.

لەناکاو گەرمی خۆر کەم بوویەوە،قوڕەیشییەکان وایانزانی هەورە بەڵام کە سەریان بەرزکردەوە هەور نەبوو ئاسمان بە باڵندەی ورد داپۆشراوە،ئەوانە سەربازانی خوابوون بۆ لەناو بردنی سوپا هاتن،هەر باڵندەیەک سێ بەردی هەڵگرتبوو قەبارەی بەقەد دەنكێك نۆک دەبوون،دانەیەک بەدەنووک دوو دانەش بە قاچەلاواز و بچووکەکانی.





لەگەڵ بەردانەوەی هەر بەردێك و بەركەوتنی هەر بەردێك بە سەربازانی سوپاكەی ئەبرەهە ڕاستەوخۆ دەمردن،كە سەربازەكان ئەمەیان بینی ئیتر جگە لەهەڵاتن و خۆ ڕزگاركردن هیچی تریان بەخەیاڵدا نەدەهات،تەیرەن ئەبابیلیش بەسەر سەریانەوە بێ بەزەییانە بەردەكانیان هەڵدەدا.

ئیتر ئەبرەهە سوپاكەی شكا و لەناوچوو و سەرزەوی پڕی بوو لەتەرمی سەربازان،چەند سەعاتێك لەمەوبەر سوپاكەی ئەو دەورو دەشتەی هێنابووە لەرزە كەچی ئێستا هاوار و ناڵە و كڕوزانەوە دەچێتە ئاسمان،ئەبرەهە خۆشی لەم توڕەیی و غەزەبەی خوا ڕزگاری نەبوو،بەڵكو خوای گەورە دەردێكی بۆنارد كە بەهۆیەوە سەر پەنجەكانی ڕزین و كە گەیشتەوە صەنعا ئەوەندەی جوجكێكی لێ مابویەوە،ئیتر سنگی لەت بوو و دڵیشی پچڕاو پاشان مرد.

ئەم هێرشە پەنجا یان پەنجا و پێج ڕۆژ پێش لەدایک بوونی پێغەمبەری خوابووە.



## بەشی چوارەم :

## چەند وێنەیەک لەژیانی پێغەمبەری خوا.لەکاتی لەدایک بوونی تا هاتنی وەحی :

### یەکەم : لەدایک بوونی پێغەمبەر :

پێغەمبەری ئیسلام محەممەد لە شاری مەککە لەڕۆژی دووشەممە، ١٢ی ڕەبیعول ئەوەلی ساڵی فیل، بەرامبەر ٢٠ یان ٢٢ی نیسانی ساڵی ٥٧١ یان ٥٧٠ی زایینی لە دایکبووە.[١]

کاتێک عەبد موتەڵیب باپیری پێغەمبەر هەواڵەکەی پێدەگات زۆری پێخۆش دەبێت و دەچێتە کەعبەوە سوپاسی خوا دەکات[٢] و ناوی محەممەدی بۆ هەڵدەبژێرێت کە لەو کاتەدا ئەو ناوە لەناو عەرەب باو نەبووە، تەنها سێ کەس هەڵگری ئەو ناوە بوون.[٣]

### دووەم : دایەن و شیردەرەکانی پێغەمبەری خوا :

لەو سەردەمەدا یاسا و باوی عەرەب وابوو منداڵەکانیان بەدایەن دەدا و خۆیان بەخێویان نەدەکرد لەنێو مەککەدا،بەتایبەت ئەوانەی دەوڵەمەند بوون ئەگەر منداڵەکەیان کوڕبووایە دەیاندا بەدایەن و دەیان ناردن بۆ لادێکان تاکو لەش

---

[١] https://mawdoo٣.com/

[٢] الرحيق المختوم

[٣] " سبب تسميته ﷺ باسم محمد - إسلام ويب - مركز الفتوى") www.islamweb.net .





ساغ و تەندروست و وریا و زیرەک بن.(عەرەب دەیانگوت منداڵی لەشاردا بەخێوکراو زەینی ڕوون نابێت و ئازا و دلێر دەرناچێت).[1]

دایەنی پێغەمبەر ئەممو ئەیمەن بەرەکەی حەبەشی بوو،کەنیزەکی باوکی بوو،یەکەم کەسیش کە شیری پێدا ثوەیبەی کەنیزەکی ئەبو لەهەبی مامی بوو.[2]

## سێیەم : بەخێوکەرو شیردەری پێغەمبەری خوا حەلیمەی سەعدیە:

دایەن و شیردەری پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، کچی عەبدوڵای کوڕی حارثە کە ناسراوە بە ئەبی ذوئەیب.[3]

حەلیمە کچێکی هەبوو بە ناوی شەیماء کە خوشکی شیریی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو.[4]

حەلیمە دەڵێت لەگەڵ برێ ئافرەتی بەنی سەعد بن بەکر چوومە دەرەوە تا بچین منداڵانی مەککە وەرگرین بۆ شیرپێدان، ئەمەش لە ساڵێکی قات و قڕی و وشکەساڵیدا بوو، هاوسەرەکەشم لەگەڵم بوو، هیچ شیریشمان پێ نەبوو، منداڵێکیشم هەبوو کە لە تاو نەبوونی شیری پێویست لە مەمکەکانمدا گریانی شەوی نەیدەهێشت بخەوم.

ئێمە گوێدرێژێکمان پێ بوو قاچی بریندار و بێهێزبوو و کەوتبووینە دوای کاروانەکە،

---

[1] muslimguide.se

[2] وقفات تربوية مع السيرة النبوية ( ل ٤٨ )

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٤.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٤.



کە هاتینە مەککە چی ئافرەت لەگەڵم بوو پێشنیازی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بۆ کرا و کەسیان ئامادە نەبوون وەریبگرن، چونکە هەموان هیوامان وابوو باوکی منداڵەکە بەخشیشمان بکات، بەڵام ئەو هەتیو بوو و دەمانگوت دەبێت دایکێك چی بکات بە منداڵە هەتیوەکەی و چی پێ بکرێت بۆی، بەڵام چی ژنم لەگەڵ بوو هەرکامیان منداڵێکیان برد، منیش پێم ناخۆش بوو بە دەستی بەتاڵەوە بگەڕێمەوە، بۆیە بەهاوسەرەکەم گوت بەخوا دەگەڕێمەوەو ئەو منداڵە هەتیوە وەردەگرم، بۆیە چووم و وەرمگرت.

دەڵێت دوای ئەوەی وەرمگرت، سوێند بەخوا هەرکە خستمە کۆشم مەمکەکانم پڕ بوون لە شیر و تێر شیری خواردەوەو براکەشی-واتە برا شیریەکەی- تێر شیر بوو، شەو هاوسەرەکەم چوو سەرێکی دا لە وشترە پیرەکەمان، دەبینێت شیری هەیە، ئەوەبوو چەندە ویستمان شیرمان لێ دۆشی و تێر شیرم خواردەوەو ئەو شەوە بە تێری و بێ برسێتی و تینوێتی خەوتین، منداڵەکەشمان خەوت.

هاوسەرەکەم گوتی ئەی حەلیمە بەخوا وادەزانم وەچەیەکی پیرۆزت تووش بووە، وا منداڵەکەمان خەوت و تێر شیریش بوو، حەلیمە دەڵێت ئینجا دەرچووین و گوێدرێژەکەم پێش هەموو کاروانەکە کەوت، ئەوانیش دەیانوت ماڵوێران چاوەڕێمان بکە، پێمان بڵێ ئەمە هەمان گوێدرێژەکەت نیە کە پێی هاتیت؟ منیش دەمگوت بەڵێ ئەوە.

سوێند بەخوا ئەوان کە بەیانییان دەکردەوە مەڕوماڵاتیان دەبردە دەرەوەو مەڕو ماڵاتەکەی منیش دەردەچوو و بە پڕشیری دەگەڕانەوەو ئەوانەی ئەوانیش بە برسێتی و بێ شیر دەگەڕانەوە، ئێمەش تێر لەو شیرەمان دەخواردەوە، کەچی





هیچکام لەوانی تر دڵۆپێك شیریشیان دەست نەدەکەوت، بۆیە بە شوانەکانیان دەگوت بۆچی مەڕومالاتەکان نابەنە لای مالاتەکەی حەلیمە، کەچی هەمان مالاتیان دەبردە لای مالاتەکەی حەلیمە، بەڵام هەر بێ شیری دەگەڕایەوە بۆ لایان، کەچی ئەوەی من بە پڕ شیری دەگەڕایەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) خێرا گەورە دەبوو، کە ساڵ تەواو بوو و بردمانەوە بۆ لای دایکی من و هاوسەرەکەم بە دایکیمان گوت ئەم منداڵەمان بدەرەوە چونکە دەترسین دەرد و نەخۆشیەکانی مەککەی تووش بێت، بەڵام مەبەستمان ئەو بەرەکەتە بوو کە لێی بەدیمان کردبوو، هێندە داوامان لێکرد تا گوتی باشە، ئەوەبوو بردمانەوە لەگەڵ خۆمان، دوو مانگ لامان مایەوە.
جارێک لە پشت ماڵەوە لەگەڵ براکەی خەریکی یاری کردن بوون و بڕێ مەڕیان دەلەوەڕاند، بینیمان براکەی بە ترسەوە هاتەوە و بە من و هاوسەرەکەمی گوت فریای برا قوڕەیشیەکەم بکەون، دوو پیاو هاتن بۆ لای و ڕایانکێشا و سکیان هەڵدڕی، ئێمەش بەپەلە چووین بۆلای دەبینین بە پێوە وەستاوەو رەنگی زەرد بووە، گوتمان کوڕی شیرینم چی بووە؟ ئەویش گوتی دوو پیاوی جل سپی هاتن بۆلام و ڕایانکێشام و سکیان هەڵدڕیم، سوێند بەخوا نەمزانی چییان کرد.
حەلیمە دەڵێت ترساین و بردمانەوە ماڵەوە، هاوسەرەکەم گوتی ئەی حەلیمە وادەزانم ئەم منداڵە حاڵی باش نیە، وەرە با بیبەینەوە بۆلای کەس و کاری پێش ئەوەی ئەو شتەی لێی دەترسین لێی دەرکەوێت، ئەوەبوو بردمانەوە بۆلای دایکی، دایکی گوتی بۆچی هێناتانەوە،خۆ ئێوە زۆر سوور بوون لەسەر ئەوەی بیبەن





لەگەڵ خۆتان؟ ئێمەش گوتمان نا بەخوا ئێمە گرتمانە خۆ و ئەرکی خۆمان بەجێگەیاند و دواتر ترساین تووشی شتێك بێت، بۆیە گوتمان با لای دایکی بێت باشترە، دایکی گوتی بەخوا مەسەلەکە ئەوە نیە، ڕاستیەکەیم پێ بڵێن، ئیتر هێندەی پێ گوتین تا ئێمەش مەسەلەکەمان بۆ باس کرد.

دایکی گوتی ئیتر ئێوەش ترسان؟! نا بەخوا ئەم کوڕەم شان و شکۆیەکی هەیە،دڵنیام خوای گەورە خراپە توشی کوڕەکەم ناکات،ئەم کوڕەی من پلە و پایەیەکی دەبێت،چونکە بەئاسانترین شێوە لەدایک بوو وە کاتێکیش لەسکمدابوو ، خەوم بینی کاتێك لەبەرم دامنا ڕووناکیەکم لێ دەرچوو کە گەردنی وشتری لە بوصرا ڕووناك کردەوە، ئینجا موحەممەدم بوو، لەدایکبوونەکەی وەك لەدایك بوونی منداڵان نەبوو، دەستی لەسەر زەوی دانا و سەری ڕووەو ئاسمان بوو، داینێن و بڕۆن بەدەم ئیشی خۆتانەوە.[١]

حەلیمە دەڵێت :ئامینەی دایکی بۆی باس کردبووین کە چۆن لە سکی گرتووەو چۆن لەدایك بووە، ئێمەش لە ڕێدا بووین کە برێ جوولەکەمان بینی، منیش بۆم باسکردن لەدایکبوونی چۆن بووە، یەکێکیان گوتی با بیکوژین، ئینجا گوتیان ئەم منداڵە هەتیوە؟ منیش گوتم نا ئەوە باوکیەتی و منیش دایکی ئەوم، ئەوانیش گوتیان ئەگەر هەتیو بوایە بە دڵنیاییەوە دەمانکوشت، ئەوەبوو چوون، حەلیمەش وتی خۆ خەریك بوو سپاردەکەم لەناو بەرم.[٢]

---

[١] صحيح ابن حبان، الرقم ٦٤٢٦، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٤٤، قال شعيب الأرناؤوط في سنده إنقطاع.

[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١١٣.





حەلـیمە پـێش ئەوەی دایەنی پێغەمبەر(ﷺ) بکـات و شـیردەری بێـت، شـیری دا بە حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) و دوای ئەوەش شیری دا بە ئەبوو سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومی.[1]

## چوارەم : وەفاتکردنی دایکی پێغەمبەری خوا :

پێغەمبەری خـوا تەمەنی شـەش سـاڵ بـوو کاتێـک دایکی وەفـاتی کرد.لەنـاوچەی " الأبـواء" لەنێـوان مەکـکە و مەدیـنە لەڕێـگەی گەڕانەوەیـان لەلای مـاڵی خـاڵوانی لەبەنی عەدی کوڕی نەجار هەر لەوێش نێژرا.[2]

## پێنجەم : لەئەستۆگرتنی لەلایەن باپیرەی :

کاتێك ئامینە وەفاتی کرد باپیرەی عەبد موتەڵیب هەڵسا بە لەئەستۆگرتنی و فەزڵیشی دەدایە سەر کوڕەکانی.

باپیرە سام و هەیبەتی هەبوو،کاتێک لەسەر جێگا دادەنیشت ئیتر هیچ کەس لەمنداڵەکانی دانەدەنیشتن،مامەکانی کەسیان زاتیان نەدەکرد لەشوێنی باوکیان دابنیشن،بەڵام پێغەمبەر دادەنیشت،مامەکانی هەوڵیان دەدا دووری بخەنەوە لەجێگاکە،بەڵام باپیرەی ڕازی دەبوو لەوێ دانیشێ و دەیگوت : ئەم کوڕەم پلە و پایەیەکی مەزنی دەبێت.[3]

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١٠٨.

[2] ابن هشام في السيرة ( ٦٨/١)،وقد صرح ابن اسحاق بالتحدث.

[3] السيرة النبوية لابن فارس (ل/١١٠ )





باپیرەی زۆری خۆشدەویست ،کاتێک دەینارد بۆ هەر کارێک ئەنجامی دەدا،جارێك ناردی بۆ دۆزینەوەی هەندێک وشتر و دواکەوت،ئیتر عەبد موتەڵیب دەستی کرد بەسوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا و دەیگوت :

ئەی خودایە محمد م بۆ بگێڕەوە ،بۆم بگێڕەوە و چاکەم لەگەڵ بکە.

جا کاتێک گەڕایەوە و وشترەکانی بۆ هێنایەوە پێی گوت: ڕۆڵەکەم وەکو ئافرەت بەشێوەیەک بۆت غەمگین بووم تاماوم هەر لەگەڵم دەبیت.

پێغەمبەر تەمەنی گەیشتە هەشت ساڵ باپیری وەفاتی کرد،ڕاسپاردەشی کرد بۆ ئەبو تاڵیبی کوڕی محمد لەئەستۆ بگرێت،ئەویش چاودێری دەکرد و سۆزی زۆری بۆی هەبوو.[1]

## شەشەم : کارکردنی پێغەمبەری خودا :

ئەبو طالیب دەست کورت بوو،بۆیە وەکو یارمەتییەک پێغەمبەری خوا هەڵدەستا بەکاری شوانی،مەڕی دەلەوەڕاند بۆ خەڵکی مەککە لەبەرامبەر بڕێک کرێدا.

کاتێ پێغەمبەری خوا ( صل الله علیه وسلم ) باسی پێغەمبەرانی تردەکات کە هەموو شوان بوونە هاوەڵان لێی دەپرسن تۆش ئەی پێغەمبەری خودا؟

پێغەمبەری خودا پێیان دەفەرموێ :- **(نعم كنتُ أرعاها على قراريطَ لأهلِ مكةَ)**[2]

واتە:- بەڵێ من شوانیم دەکرد بەرامبەر چەند درهەمێک بۆ خەڵکی مەککە.

---

[1] صەلابی

[2] الراوي | - : المحدث : الألباني | المصدر : مشكلة الفقر | الصفحة أو الرقم | ٣٢ : خلاصة حكم المحدث : صحيح





کاتێك پێغەمبەری خوا تەمەنی بووە دوانزە ساڵ ئەبو تالیب لەگەڵ خوێدا بردی بۆ سەفەری بازرگانی لەشام، وە لەوێ و لەڕێگەیاندا بە بوحەیرای گۆشەگیر گەیشتن،بەو نیشانانەی کەلای خاوەنانی کتێب ناسراو و زانرابوو ناسیەوەو زانی کە پلەو پایەی دەبێ.

بوحەیرا کەئەوەی بۆ دەرکەوت سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەبو طاڵب بیگەڕێتنێتەوە بۆ مەککەو سەفەرەکەی پێ نەکات، ئەویش لەبەر مەترسی جوولەکە.(چونکە ئەگەر بیانزانیایە لەوانە بوو بیکوژن)

## حەفتەم : بەژداریکردن لە جەنگی فیجار:

ئەم جەنگە هەڵگیرسا لەنێوان قوڕەیش و هاوپەیمانان لەهۆزی کینانەو هۆزی هەوازین.

قوڕەیش لەم شەڕە پشتی هۆزی کینانەی دەکرد،پێغەمبەری خوداش ئامادەی هەندێ لەو جەنگانەبوو و تیری بۆ مامەکانی ئامادە دەکرد .

**پەیمانی فضول:**پێغەمبەری خوا ئامادەی پەیمانی فضول (حلف الفضول) بوو، کە پەیمانێك بوو هەندێ لە هۆزەکانی قوڕەیش بەستیان بە مەبەستی یارمەتیدانی ستەملێکراوو چەوساوەکان و ماف سەندنەوەی مافخوراوان..



لە موسنەدی ئیمام ئەحمەد هاتووە: **( شهدت في دار عبدالله بن جدعان حلفاً ما أحب أن لي به حمر النعم، ولو دعيت إليه في الإسلام لأجبت)**[1]

(ئامادەی پەیمانێك بووم لە ماڵی عبداللهی کوڕی جەدعان خۆشەویستر بوو لە لام لە ئاژەڵە سوورە (ئەو کاتە ئاژەڵی سوور بە تایبەت حوشتر زۆر بە نرخ بووە)، خۆ ئەگەر لە ئیسلامیشدا بانگ کرامەوە بۆ پەیمانێکی وەها ئەوە دێم بە دەمیەوە)

لەو دانیشتن و پەیماننامەیەدا، گرێ و پەیمان بەسترا لە سەر بە دەمەوە هاتنی مافخوراوان و بەرگریکردن لێیان، تاکو مافیان نەخورێت و ستەمیان لەسەر لابرێ،وە پێغەمبەر (ﷺ)بەم پەیمانەدا هەڵیداوەو وەسفی کردووە -وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە- چونکە پەیمانەکە بانگەشەی نەکرد بۆ دەمارگیری و هەڵچونی نەفامی، بەڵکو لەبەر سەرخستن و یارمەتیدانی ستەملێکراوان بوو.

## هەشتەم : هاوسەرگیری لەگەڵ دایە خەدیجە :

خەدیجەی کچی خوەیلیدی کوڕی عەبدولعوززای قوڕەیشی ئەسەدیە، خێزانی یەکەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و یەکەم ئافرەتی موسڵمان بووە، دایکی ناوی فاطیمەی کچی زائیدەیە[2].

خەدیجە لەناو هۆزەکەیدا زۆر ناسراو بوو، چونکە هەم لەخێزانێکی ناسراو بوو، هەم سامانێکی زۆر زۆری هەبوو و هەمووان حەزیان دەکرد ئەو ئافرەتە بخوازن.[3]

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام(٢٤/١)فقه السيرة للغضبان.(ل.١٠٢).

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١٣١.





خەدیجە هێندە بە پاکداوێن ناسرابوو کە لەناو هۆزەکەیدا بە ئافرەتە پاکەکە ناوی دەرچووبوو.[1]

## سەرەتای یەکترناسین

خەدیجە سامانێکی زۆری هەبوو، بۆیە داوای لە پیاوانێکی شارەزا دەکرد تا کاری بازرگانی بۆ بکەن، بەرامبەر بەوە بڕێك قازانجی دەدا پێیان، جا کاتێك راستگۆیی و دەستپاکی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بیست بڕیاریدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) مامەڵە بکات[2]، بۆیە داوای کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) تا کاری بازرگانی بۆ بکات، پێغەمبەریش (ﷺ) رازی بوو، ئەوکات هێشتا نەبووبوو بە پێغەمبەر و لەتەمەنی لاویدا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ مەیسەرەی مەولای خەدیجەدا چوو بۆ شام تا کاری بازرگانی بکات بۆ خەدیجە، کە گەیشتنە شام پێغەمبەر (ﷺ) لە ژێر سێبەری دارێکدا دانیشت، کابرایەکی ڕاهیب ئەوی بینی، بە مەیسەرەی وت ئەم کابرایە کێیە؟ ئەویش گوتی: کەسێکی قوڕەیشیە، ڕاهیبەکە گوتی تەنها پێغەمبەران لەژێر سێبەری ئەم دارەدا دانیشتوون، ئینجا گوتی ئایا سوورایيەك لەنێوچاوانیدا هەیە؟ مەیسەرە گوتی بەڵێ، ڕاهیبەکە گوتی دەی هەرگیز لێی جیا مەبەرەوە، ئەوە کۆتای پێغەمبەرانە و خۆزگە منیش دەگەیشتمە کاتی پێغەمبەرایەتیەکەی، ئینجا کە هاتنەوە خەدیجە قازانجی زۆر زۆری دەکرد لەو کارەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها مەیسەرە ئەو قسەی ڕاهیبەکەشی بۆ خەدیجە گێڕایەوە[3]،

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٥.

[2] أسد الغابة، ج٧، ص ٩٠.

[3] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠٦.



ئەوەبوو دڵی چوویە سەر پێغەمبەر (ﷺ) و پێشنیازی خۆی کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا ببێتە هاوسەری[1].

**پێشنیاری خەدیجە(رضي الله عنها) بۆ هاوسەرگیری:**

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) و مەیسەرە گەڕانەوەو مەیسەرە باسی قسەی راهیبەکەی کرد، خەدیجە کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێی وت پێی بڵێت:(ئەی ئامۆزا من دڵم چوەتە سەر تۆ لەبەر نزیکی و خزمایەتیت لێم، لەبەر کەسایەتی و نێوەندبوون و سپاردەکاریت لەنێو هۆزەکەتدا، لەبەر ڕەوشت جوانی و راستبێژیت)[2]، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چوو لای مامەکانی مەسەلەکەی باس کرد و دواتر حەمزەی مامی لەگەڵی چوو بۆ لای خوەیلید و داوای خەدیجەی کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش مارەی کرد لێی.[3]

**کات و تەمەنی هاوسەرگیریەکە:**

سەبارەت بە کاتی هاوسەرگیری خەدیجەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند ڕایەکی جیاواز هاتووە،لەوانە:

-خەدیجە تەمەنی چلساڵان بووە.

-تەمەنی بیست و هەشت ساڵان بووە.[4].

- تەمەنی خەدیجە ئەوکات سی و پێنج ساڵان بووە.

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٤.
[2] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٣٩٤.
[3] أسد الغابة، ج٧، ص ٩١.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١١.



-بیست و پێنج ساڵان بوو.[1]

سەبارەت بە تەمەنی پێغەمبەریش (ﷺ) ڕایەك دەڵێت: تەمەنی بیست و یەك ساڵان بووە، ڕایەکی تریش دەڵێت: تەمەنی بیست و پێنج ساڵان بووە.[2]

ماوەی پێکەوە ژیانیشیان نزیکەی بیست و پێنج ساڵ بووە، چونکە بە گونجاندنی کاتی هاوسەرگیریەکەو تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) و کاتی وەفاتی خەدیجەدا دەزانین نزیکەی بیست و پێنج ساڵ پێکەوە ژیاون.

**سەرنجێك :**

تەمەنی دایە خەدیجە چل ساڵان نەبووە، چونکە ئافرەت لە تەمەنی چل ساڵ بە دواوە ئەگەری منداڵ بوونی زۆر کەم دەکات، چ جای ئەوەی چەند منداڵێکی ببێت، پێغەمبەریش (ﷺ) پاش پانزە ساڵ لەو هاوسەرگیریە ئینجا بوو بە پێغەمبەر (ﷺ) تا بڵێین موعجیزەیەکی خودایی بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و هیچ دەقێکیش لەو بارەوە نیە.

(بۆ زانیاری زیاتر ئەتوانن بگەڕێننەوە بۆ لێکۆڵینەوەکەی دکتۆر أکرم ضیاء العمري لە (السیرة النبویة الصحیحة) دا و هەروەها لە کتێبی (ما شاع ولم یثبت من السیرة) دا باسکراوە).

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٥.

[2] أسد الغابة، ج٧، ص ٩٠.



**ژیانی ژن و مێردایەتی:**

خەدیجە لەماوەی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) تەنانەت لەو کاتەش کە پێغەمبەر نەبوو زۆر ڕێزی دەگرت لێی و بە گەورە تەماشای دەکرد و پێغەمبەر (ﷺ) هەر چی بفەرمـوایە ئەو بـڕوای پێـدەکرد،[1] هەڵسـوکەوتێکی ژنێکی سـەلار بەرامبەرمێردێکی سەلار.

خەدیـجە خزمەتکـارێکی کڕیبـوو بە نـاوی زەیـدی کـوڕی حارثـە، هێشـتا پێغەمـبەر (ﷺ) سروشی بۆ دانەبەزیبوو، بەڵام خۆشەویستی بۆ زەیـد زۆر بـوو، خەدیـجە کە بینی پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی زۆر خۆشدەوێت زەیدی پێ بەخشی.[2]

**نۆیەم : دانانەوەی بەردە ڕەشـەکە :**

پێغەمبەر(ﷺ)تەمەنی گەشتە سی و پێنج ساڵ،لەگەڵ ڕۆڵەو نەوەکانی گەلەکەیدا بەشداری کرد لە دروستکردنەوەی کەعبە کاتێك لافاو لێیداو بنەکەی ڕاماڵی و نزیك بوو بیڕوخێنێ، لە بوخاریدا لە فەرمودەی جابرەوە کە فەرمویەتی:

**( لما بنيت الكعبة ذهب النبي صلى عليه وسلم والعباس ينقلان الحجارة )**

(کاتێ کەعبە دروستکرایەوە هەڵچنرایەوە پێغەمبەر لەگەڵ عەباسدا –مامی- بەردیان دەگواستەوە بۆی).

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٤.





وە لەو بەشداری و هاوبەشیانەی ئەوە بوو کە کاتێ کەعبە دروستکرایەوەو ویستیان بەردە ڕەشەکە بخەنەوە شوێنی خۆی –پاش ئەوەی جیاوازیان تێکەوت کە کامیان بەردە ڕەشەکە دابنێ و گەشتە ڕاددەی ناخۆشی-

پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی پێ کردن کە بەرگێك بێنن و بەردەکەی بخەنە سەر، وە هەر سەرۆك تیرەو هۆزێکیش لەلایەکیەوە دەستی بداتێ و بەرزی بکاتەوە تا هەموو بەشدار بن، ئەوجا کاتێ بەگوێیان کردو بەرزیان کردەوە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)خۆی بەردەکەی هەڵگرت و خستیە شوێنی خۆی و ناکۆکی و مەترسی بە یەکاچونیشی لێ دوورخستنەوە و هەموو بەیەکەوە ڕازی بوون.

بەمشێوەیە دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) لەخۆشی و ناخۆشی،لەشەڕ و ئاشتی، بەژداری کردوون،ئەوەی ئەوان چێشتویانە ئەمیش بەوشێوە،ئازارو ئەشکەنجەو تەنگەشەیان توش هاتبێ ئەمیش لە گەڵیان بووەو لە ناویان بوو، هەروەك خوای گەورە ئامادەی کردبێ بۆ کارێکی قورس و مەبەستێکی گەورە، ئەوەتە خوای گەورە ئەو پلەو پایە بەرزەی پێ بەخشیبوو لە ناو گەلەکەیدا، لە دڵی خەڵکیدا شیرین و خۆشەویست ببوو، ڕێزو هەیبەتێکی تایبەتی هەبوو، تەنانەت وەسفی دەسپاك "الأمین"یان دا بەسەریدا کە هیچ کەسێك خاوەنی ئەو وەسفە نەبوو، ئەویش لە بەر ئەمینی و پاراستنی ئەمانەت و ڕاستگۆیی لە گەڵ گەلەکەی.[١]

---

[١] سایتی (الشبکه الاسلامیه)



## دەیەم : خواپەرستیی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەشکەوتی (حراء).

پێغەمبەری (ﷺ) هەر لە منداڵیەوە بیری ئەکردەوە لە گەلەکەی کە بۆ شوێن بەندایەتی نابەجێ و خەیاڵات و ئەندێشەو شتی پڕو پووچ کەوتوون، کارو کردەوەو بیروباوەڕیان هیچ نەدەچووە دڵیەوە، عەقڵ و ژیری ئەمەی وەرنەئەگرت و نەیدەسەلماند،چۆن شتانێك دەپەرستن لەداروبەردو کڕونشیان بۆ دەبەن جگە لە خوا!، ئەمەش هەمووی بەهۆی ئاگاداری و چاودێری خواوە بوو بۆی، کە وەك مرۆڤەکانی تر نەبوو،پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر پاك و بێگەردی مایەوەو هیچ خەوش و لەکەیەکی تێکەڵ نەبوو .

ئەم حاڵەی کە پێغەمبەر (ﷺ) تیایدا دەژیا پاڵی پێوەنا دورەپەرێز بوەستێ لەوەی گەلەکەی لەسەرینە و تێکەڵاویان نەبێ، تەنها لەشتانێکدا کە خێرو چاکە بن وەك یارمەتی هەژاران، پاڵپشتی بێ دەسەڵات و لاوازەکان، ڕێزگرتنی میوان، گەیاندنی بەزەیی و بەسەر کردنەوەی خزمان،ئیتر خواردن و خواردنەوەی لەگەڵ خۆیدا دەبردو بەرەو ئەشکەوتی حیراء بەڕێ دەکەوت، وەك لە فەرموودە لە هەردوو سەحیحدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **( جاورت بحراء شهراً...)** (لە حیراء مانگێك مامەوە...) .

"حراء" یش ئەشکەوتێکی بچووکە لەسەر کێوی تور لەدووری دوو میل لە مەککەوە،جگە لەشاخی بەرزو ئاسمانی بێگەرد هیچی تر بەدەوری ئەم ئەشکەوتەوە نابینی، ئەوانیش پاڵنەرن بۆ زیاتر بیرکردنەوەو قوڵبوونەوە .

پێغەمبەر(ﷺ)چەندەها شەوو ڕۆژ لەم ئەشکەوتەدا دەمایەوەو بەندایەتی دەکرد، بیری لەزەوی و ئاسمانەکان و گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار دەکردەوە، بیری لە





گەل و نەتەوەکەی دەکردەوە چۆن وا لەسەر گومڕایین و دوورن لە خوا، دڵنیاو دڵخۆش نەبوو بەوەی گەلەکەی لەسەری بوون،بەڵام ڕێگەیەکی ڕۆشن و نەخشەو پەیڕەوێکی دیاریکراوی لەبەر دەستدا نەبوو لەسەری بڕوات و دڵنیاو ڕازیبێت لێی .

وە زۆرترینی کاتی دەمایەوە لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆزدابوو،خەدیجەی دایکی باوەڕدارانی بەجێ دەهێشت و بەتەنها لەو ئەشکەوتەدا دەمایەوەو خواپەرستی دەکردو بیری دەکردەوە ڕووی دەکردە پەروەردگاری .

ڕیوایەتەکان باسی چۆنیەتی ئەو شێوازو سیفاتانەیان نەهێناوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چۆن بەندایەتی کردووەو چی گوتووەو چی کردووە، بەڵکو مەبەستی دوورکەوتنەوە بووە لەو حاڵەتەی گەلەکەی تیایدایە لە بت پەرستی و گۆشەگیر بوون لێیان، بیرکردنەوە لە فراوانی ئاسمانەکان و دروست بوونی زەوی .

وە هەڵبژاردنیشی بۆ ئەم خۆگرییە لەو هۆکارانەبوو خوای گەورە بۆی ئامادە کردبوو تاکو ئامادەی بکات بۆ ئەوکارە گرنگ و قورسەی کە لە پاشاندا پێی دەسپێردرێت، وە ئەو گرنگیە گەورەیەی کە پێی هەڵدەستێ، کە بریتیە لە گەیاندنی پەیامی خوا بە هەموو خەڵکی بەگشتی، وە لێرەوە لەحیکمەت و دانایی خوای گەورە تێدەگەین کە یەکەم ئایەتێك و یەکەم گزنگی وەحی لەم ئەشکەوتەوە دەست پێ بکات .

بەڕاستی ئەم ئەشکەوتە لەقۆناغێك لەقۆناغەکانی ئەم بانگەوازەدا دەرکەوت و لەپێش و لەکاتی ڕەوانەکردنیشدا گرنگی بەرچاوی خۆی بینی، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر(ﷺ)پاش ئەوەی بەجێی هێشت و دەستی کردە بانگەواز بۆلای پەروەردگاری ئیدی سەردانی ئەم ئەشکەوتەی نەکردەوە،وە هاوەڵەکانیش



هەروەها سەردانیان نەدەکردو سەرنەدەکەوتن بۆی، وە لێرەوە دەزانین ئەوەی ئەمڕۆ خەڵکی دەیکەن لەسەرکەوتن بۆ ئەو ئەشکەوتەوە نوێژ تیا خوێندنی کارێکی ناشەرعیەو ڕێی پێ نەدراوە .



